نحو: اِخْرَنْجَمَ، يَخْرَنْجِمُ، اِخْرِنْجاماً. وَ افِعَلَلَّ نحو: اِقْشَعَرَّ، يَقْشَعِرُّ، اِقْشِعْرَاراً.

---

فعلی رباعی مزید فیه که ماضی‌یه‌که‌ی شه‌ش حه‌رف بێ چواری ئه‌صڵی و دووی زیاده وه له‌سه‌ر وه‌زنی افعنلل «نحو: اِخْرَنْجَمَ، يَخْرَنْجِمُ، اِخْرِنْجاماً».

اِخْرَنْجَمَ فعلی ماضی‌یه ئه‌صڵه‌که‌ی حَرْجَمَ بوو هاتین له ئه‌وه‌ڵیه‌وه هه‌مزه‌ی وه‌صڵی مکسوره‌مان دانا، فاءالفعله‌که‌مان ساکن کرد وه عین‌الفعله‌که‌مان مه‌فتوح کرد وه هاتین (ن) زائده‌ی ساکنه‌مان له‌به‌ینی عین‌الفعل وه لام‌الفعلی ئه‌وه‌ڵیا دانا گه‌ڕا به اِخْرَنْجَمَ.

يَخْرَنْجِمُ فعلی مضارعه ئه‌صڵه‌که‌ی اِخْرَنْجَمَ بوو (ی) حه‌رفی مضارع بوو زیادمان کرد له ئه‌وه‌ڵیه‌وه به مه‌فتوحی وه لام‌الفعلی ئه‌وه‌ڵمان مکسور کرد وه لام‌الفعلی دووهه‌ممان مرفوع کرد گه‌ڕا به يَخْرَنْجِمُ.

اِخْرِنْجاماً مصدره وه ئه‌صڵه‌که‌ی احرنجم بوو عین‌الفعله‌که‌مان مکسور کرد وه ئه‌لفێکمان له‌به‌ینی هه‌ردوو لام‌الفعله‌که‌یا دانا وه تنوین که عه‌لامه‌تی مصده‌ر بوو ئیلحاقمان کرد به ئاخریه‌وه گه‌ڕا به اِخْرِنْجاماً.

ئه‌م بابه بابی (افعنلال)ه قاعده‌ی بابی **افعنلال** ئه‌مه‌یه: ـ هه‌ر فعلی رباعی مزیدفیه بێ وه ماضی‌یه‌که‌ی شه‌ش حه‌رف بێ وه له‌سه‌ر وه‌زنی **افعنلل** بێ ئه‌وه له‌و بابه‌یه.

«وَ اِفعَلَلَّ» عطفه له‌سه‌ر قه‌ولی مصنف که فه‌رمووی **افعنلل** / مثالی فعلێ رباعی مزیدفیه‌یه که ماضی‌یه‌که‌ی له‌سه‌ر شه‌ش حه‌رف بێ چواری ئه‌صڵی و دووی زیاده‌وه له‌سه‌ر وه‌زنی اِفْعَلَلَّ بێ «نحو: اِقْشَعَرَّ، يَقْشَعِرُّ،

اِقْشِعْراراً.

اِقشَعَرَّ فعلی ماضی‌یە ئەصڵەکەی قَشْعَرَ بوو هاتین لە ئەوەڵیەوە هەمزەی وەصڵی مکسورەمان دانا وە فاءالفعلەکەمان ساکن کرد وە عین‌الفعلەکەمان مەفتوح کرد وە لام‌الفعلی دووهەممان مکرر کرد گەڕا بە اِقْشَعْرَرَ جا اجتماع‌المثلین روی دا ئەوەش گران بوو لەسەر زمان هاتین نەقڵی حەرەکەی مثلی ئەوەڵمان کرد بولای ماقبلەکەی وە دەغممان کرد لە مثلی دا گەڕا بە اقشعرَّ.

یقشعرُّ فعلی مضارعە ئەصڵەکەی اقشعرَّ بوو (ی) حەرفی مضارع بوو لە ئەوەڵیەوە زیادمان کرد بە مەفتوحی لام‌الفعلی ئەوەڵمان مکسور کرد وە لام‌الفعلی دووهەممان مرفوع کرد گەڕا بە یقشعِرُّ.

اقشِعْراراً مصدەرە ئەصڵەکەی اقشعرَّ بوو فاءالفعلەکەمان مکسور کرد وە لام‌الفعلی ئەوەڵمان ساکن کرد، وە فەکی ئدغامەکەمان کردەوە وە ئەلفێکمان زیاد کرد لەبەینی هەردوو مکرەرەکەدا وە تنوین کە عەلامەتی مصدەر بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە اِقْشِعْراراً.

ئەم بابە بابی (افعلاّل)ە قاعدەی بابی افعلاّل ئەمەیە کە هەر فعلێ رباعی مزید فیە بێ وە ماضی‌یەکەی شەش حەرفی بێ وە لەسەر وەزنی اِفْعَلَلَّ بێ ئەوە لەو بابە یە، وەکو اِطْمَئَنَّ، یَطْمَئِنُّ، اِطْمِئْناناً.

# «المتعدی و اللاّزم»

«اَلْفِعْلُ اِمَّا مُتَعَدٍّ» «وَ هُوَ الَّذی یَتَعَدّیٰ مِنَ الْفاعِلِ اِلیَ الْمَفْعُولِ بِـهِ» «کَقَوْلِکَ ضَرَبْتُ زَیْداً» «وَ یُسَمَّی أیضاً، واقعاً و مُجٰاوِزاً»

---

تَنْبِیهٌ: بێدار کردنەوەی مامۆستایە بۆ شاگردەکان بۆ ئەوەی هـەرچـی رابــوردوە حـازری بکـەن لەلای خـۆیان وە چـاوەڕوان بـن بـۆ ئـەوەیش ئەخوێنرێتەوە بۆیان «اَلْفِعْلُ اِمَّا مُتَعَدٍّ» هەرچی فعلە سێ حەرفی یا چوار حەرفی مجرّد یا مزید فیە یا فعلی متعدیٖیە «وَ هُوَ الَّذِی یَـتَعَدّٰی مِـنَ الْفَاعِلِ اِلَی الْمَفْعُولِ بِهِ» کە بەو فعلە ئەڵێن مەعناکەی وە ئەو کردەوە کە لەو دەرئەکـەی تـەجاوز بکـا لە فـاعلەوە یـانی لە خـاوەن کـارەوە بـۆلای مَفْعُولٌ بِهِ کە مەحلی ئەوکارەیە «کَقَوْلِکَ ضَرَبْتُ زَیْداً» ئیستە فعلێ وەکو ضَرَبَ بێ بە ئیعتباری ئەو کردەوە کەلێی دەر ئەکەوێ تەجاوزی کردوە لە خاوەنکارەکەوە وەکو بویژ بێ بۆلای مَفْعُولٌ بِهِ کە ئینسانە لێدراوەکـەیە وەکو زەید بێ: دیارە کە لێدان لێدەر وە لیدراوی ئەوێ.

«وَ یُسَمَّی أیضاً، واقعاً و مُجٰاوِزاً» وە ئەو فعلە کە تجاوزی کردوە بە ئیعتباری مەعناکەی لە فاعلەوە بۆلای مَفْعُولٌ بِهِ وەکو پێی وتراوە متعدی ناویش براوە بە واقع چونکە پاش ئەوە صادر بوو لە فاعلەوە واقع ئـەبێتە سەر مفعول.

وَ اِمّا غَیْرُ مُتَعدٍّ وَ هُوَ الْفِعْلُ الَّذِی لَمْ یَتَجٰاوَزِ الفٰاعِلَ الی المفعولِ بِهِ کَقَوْلِکَ حَسُنَ زَیْدٌ وَ یُسَمّٰی لاٰزِماً وَ غَیْرَ واقعٍ و تُعَدِّیهِ فِی الثلاثِیِّ المجرَّدِ بِتَضْعِیفِ العَیْنِ و بِالْهَمْزَةِ

---

وە ناویش ئەبرێ بە مُجٰاوِز چونکە تەجاوز ئەکات لە فاعلەوە بۆ سەر مَفْعُولٌ بِهِ: «وَ اِمّا غَیْرُ مُتَعدٍّ» عطفە لەسەر قەولی مصنف کە فەرموی اِمّا مُتَعَدٍّ، یانی یا فعل غەیرە متعدی ئەبێ «وَ هُوَ الْفِعْلُ الَّذِی لَمْ یَـتَجٰاوَزِ الفٰاعِلَ الی المفعولِ بِهِ» واتە فعلی غیرە متعدی ئەوەیە کە تەجاوز نەکا وە لانەدا لە فاعلەوە بۆ سەر مَفْعُولٌ بِهِ «کَقَوْلِکَ حَسُنَ زَیْدٌ» ئێستە ئەم فعلە بە ئیعتباری مەعناکەی کە حوسنە تەجاوز ناکات لە فاعلەکەوە کە زەیدە بۆلای مَفْعُولٌ بِهِ چونکی جوانی صیفەتێکە موحتاج نیە بە غەیری موصوفەکەی وە پێویستی نیە بە لادان لەو مەوصوفەوە بۆلای غەیری ئەو «وَ یُسَمّٰی لاٰزِماً وَ غَیْرَ واقعٍ» وە ئەم فعلە غیرە متعدی‌یە ناویش ئەبرێ بە لازم لەبەر ئەوە لازمە بۆ فاعلەکەی وەلێی جیا نابێتەوە، وە بە غیرە واقع چونکە واقع نابێتە سەر مَفْعُولٌ بِهِ.

جا لەبەر ئەوە فعلی لازم ئەبێ بە متعدی بە چەند ئەسبابێ مصنف فەرموی: «و تُعَدِّیهِ فِی الثلاثِیِّ المجرَّدِ» یانی تۆ ئەتوانی فعلی لازم بکەی بە متعدی لە ثلاثی مجردا «بِـتَضْعِیفِ العَـیْنِ» بەهۆی تکرار کردنەوەی عین‌الفعلەکەی وە نقل‌کردنی بۆ بابی تفعیل «و بِالْهَمْزَةِ» وە بە هۆی زیادکردنی هەمزەی قطعی مەفتوحە لەسەر ئەو فعلەوە نقل‌کردنی بۆ

## كقولك فرَّحتُ زيداً وَ أَجْلَسْتُهُ

بابی اِفْعال.

جا مثالی فعلی ثلاثی مجردی لازم كـه بیكەی بـه مـتعدی بـه هـۆی تكراری عین‌الفعله‌كه‌یه‌وه وه نقل‌كردنی بۆ بابی تفعیل «كقولک فرَّحتُ زیداً» یانی زه‌یدم دڵخۆش كرد ئـه‌صڵه‌كـه‌ی فَـرِحَ زَیْـدٌ بـوو لازم بـوو ویستمان بیكه‌ین به متعدی عین‌الفعله‌كه‌مان مه‌فتوح و مكرر و مدغم كرد، زید فاعل بوو كردمان به مَفْعُولٌ بِهِ وه ره‌فعه‌كه‌مان گۆڕی به نـصبه (ت) ضمیری متحرک موجبی سكونی ماقبلی بوو ماقبله‌كه‌مان ساكن كرد گه‌ڕا به فرَّحْتُ زیداً.

ئێسته فعلێ وه‌كو فَرَّحْتُ له‌بابی تفعیل به ئیعتباری مه‌عناكه‌ی كه تفریح وه دڵخۆش كردنه تجاوزی كرد وه له فاعله‌كه‌یه‌وه وه‌كو متكلم بێ بۆلای مه‌فعول به كه زَیْده.

«وَ أَجْلَسْتُهُ» عطفه له‌سه‌ر قه‌ولی مصنف كه فه‌رموی: (فَرَّحْتُ زیداً) مثالی فعلی ثلاثی مجردی لازمه كه بیكه‌ی به متعدی به‌هۆی نقل‌كردنی بۆبابی اِفْعال، وه زیادكردنی هه‌مزه‌ی قه‌طعی مه‌فتوحه‌وه وه‌كو أَجْـلَسْتُهُ ئه‌صڵه‌كه‌ی جَلَسَ زَیْدٌ بوو لازم بوو ویستمان بیكه‌ین به متعدی نه‌قڵمان كرد بۆ بابی اِفعال به‌م جۆره هه‌مزه‌ی قه‌طعی مه‌فتوحه‌مان له ئـه‌وه‌ڵیه‌وه زیادكردوه فاءالفعله‌كه‌مان ساكن كرد زید فاعل بوو كردمان به مفعولٌ‌بِهِ وه ره‌فعه‌كه‌مان گۆڕی به نصبه‌وه (ت) ضمیری فاعلی متكلمی وحـده بـوو ئیلحاقمان كرد به ئاخریه‌وه وه ماقبله‌كه‌مان ساكن كرد وه به به‌ده‌لی ئیسمی ظاهر ضمیرمان هێنا گه‌ڕا به أَجْلَسْتُهُ.

وَ بِحَرْفِ الْجَرِّ فِي الْكُلِّ ذَهَبْتُ بِزَيْدٍ وَ انْطَلَقْتُ بِهِ.

---

ئێستە فعلێ وەکو أَجْلَسَ بێ بە ئیعتباری مەعناکەی کە دانیشاندنە تجاوزی کرد وە لە فاعلەکەوە کە ضمیری متکلمە بۆلای مفعولٌبِهِ.

«وَ بِحَرْفِ الْجَرِّ فِي الْكُلِّ» عەتفە لەسەر قەولی مصنف کە فەرمووی: بالهمزة: یانێ فعلی لازم ئەکەی بە متعدی بە هۆی داخلکردنی حەرفی جەر، لە هەموو نەوعی لەفعلی لازما، ثلاثی بێ یا رباعی مجرد بێ یا مزیدفیە، «نحو: ذَهَبْتُ بِزَيْدٍ» یانێ زەیدم برد بەرێوە، ئەصڵەکەی ذَهَبَ زَيْدٌ بوو لازم بوو، ویستمان بیکەین بە متعدی زید فاعل بوو کردمان بە مفعولٌبِهِ بەهۆی داخلکردنی حەرفی جەر لەسەری وە ضمیری متحرک فاعیلمان ئیلحاق کرد بە فعلەکەوە وە ماقبلەکەمان ساکن کردگەڕا بە (ذَهَبْتُ بِزَيْدٍ)، ئێستە ذَهَبَ بوە بە متعدی بەهۆی داخلکردنی حەرفی جەر لەسەر زەید مەعناکەی کە ڕویشتن بوو گوڕا بە ڕەواندن.

«وَ انْطَلَقْتُ بِهِ» عەتفە لەسەر قەوڵی مصنف کە فەرموی: ذهبت بزید، ئەصڵەکەی اِنْطَلَقَ زَيْدٌ بوو وە لازم بوو، ویستمان بیکەین بە متعدی هاتین (ت) ضمیری متحرکی وحدەمان ئیلحاق کرد پێوە، وە ئاخرەکەمان ساکن کرد وە زید فاعل بوو کردمان بە مفعولٌبِهِ بەهۆی حەرفە جەرەکەوە، وە تەبدیلمان کرد بە ضمیر منصوب گەڕا بە اَنْطَلَقْتُ بِهِ یانێ زەیدم بەرەڵلا کرد، ئێستە انطلق‌ی متعدی بە هۆی (ب) بە ئیعتباری مەعناکەی وەکو انطلاق بێ تجاوزی کردوە لە فاعلەکەوە کە متکلمە بۆ لای مفعولٌبِهِ کە ضمیرە منصوبەکەیەو ئەگەڕێتەوە بۆ زەید.

# «فَصْلٌ فِی أَمْثِلَةِ تَصْرِيفِ هٰذِهِ الأَفْعٰالِ»

## الفعل الماضی المبنیّ للفاعل

أَمّٰا الْمٰاضِی فَهُوَ مٰادَلَّ عَلَی مَعْنیً وَجَدَ فِی الزَّمٰان المٰاضِی

---

ئەمە فەصلێکە دانراوە بۆ باسی ئەو مثالانە وە ئەو صیغانە، وەکو: فعلی ماضی، وە فعلی مضارع وە فعلی ئەمر وە نەهی وە ئیسمی فاعل وە ئیسمی مفعول وە غەیری ئەمانە کە پەیدا ئەبن لە گوڕاندنی مصادری ئەو فعلانە کە لەمەوبەر ڕابوردن...

جا لەبەر ئەوە یەکەم شتێ دروست بکرێ لە مصدەر فعلی ماضییە، مصنف باسی فعلی ماضی خستە پێشەوەو فەرموی: «أَمّٰا الْمٰاضِی فَهُوَ مٰادَلَّ عَلَی مَعْنیً وُجِدَ فِی الزَّمٰانِ الْمٰاضِی».

واتە: فعلی ماضی کە یەکێکە لەو مثالانە: ـ بە لەفظێ ئەڵێن دەلالەت بکات لەسەر مەعنایی کە پەیدا بووبێ لە زەمانی ڕابوردودا.

جا لەبەر ئەوە کە فعلی ماضی لەسەر دوبەشە: ١ـ بەشی بینا فاعل. ٢ـ بەشی بینا مفعول. وە مصنف بەو جۆرە باسی کردن، وە

فَالْمَبْنِيُّ لِلْفاعِلِ مِنْهُ ما كانَ أَوَّلُهُ مَفْتُوحاً أَوْ أَوَّلُ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَفْتُوحاً نحو قَوْلِكَ نَصَرَ نَصَرا نَصَرُوا نَصَرَتْ نَصَرَتا

---

فەرموی:«فَالْمَبْنِيُّ لِلْفاعِلِ مِنْهُ» فعلی بنا فاعل لە فعلی ماضیدا «ما كانَ أَوَّلُهُ مَفْتُوحاً أَوْ أَوَّلُ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَفْتُوحاً» ئەوەیە کە ئەوەڵ حەرف لەودا مفتوح بێ، وە یا ئەوەڵ متحرکی موعتەبەر لەودا مفتوح بێ. وە ئەمە تعریف بوو بۆ فعلی بینا فاعلی ماضی بە ئیعتباری لەفظەکەی، وە ئەما بنا فاعل بە ئیعتباری معنا ئەوەیە کە ناوی فاعلەکەی [لە جملەدا] برا بێ.

جا میثالی ئەو بنا فاعلەی کە ئەوەڵ حەرف لەوا مفتوح بێ «نحو قَوْلِكَ نَصَرَ» بۆ مفردی مذکری غائب. «نَصَرا» بۆ تەثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی نَصَر بوو ئەلف ضمیری فاعلی تەثنیە بوو لاحقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە نَصَرا. «نَصَرُوا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵەکەی نَصَرَ بوو، واو ضمیری فاعلی جمعی مذکری غائب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە لەبەر ئەوە موقتضی ضمەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مضموم کرد گەڕا بە نَصَرُوا.

«نَصَرَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب ئەصڵەکەی نَصَرَ بوو (ت) ساکنە عەلامەتی تأنیث بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە نَصَرَتْ.

«نَصَرَتا» بۆ تەثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی نَصَرَتْ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تەثنیە بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، ئەلف موقتضی فەتحەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە نَصَرَتا.

## نَصَرْنَ نَصَرْتَ نَصَرْتُمَا نَصَرْتُمْ

«نَصَرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب ئەصڵەکەی نَصَرَتْ بوو، نون ضمیری فاعلی جەمعی مؤنث بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە نَصَرَتْنَ دو عەلامەتی تأنیث کۆ بوونەوە درۆست نەبوو حەذفی نوونەکە بکەین چۆن دەلالەتی ئەکرد لەسەر تأنیث وە جەمعیەت، بەلام حەذفی (ت)کەمان کرد چۆنکە هەر تأنیثی ئەگەیاند گەڕا بە نَصَرْنَ.

«نَصَرْتَ بۆ مفردی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی نَصَرَ بوو، (ت) مفتوحە ضمیری فاعلی مفردی مذکری مخاطب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە لەبەر ئەوە کە ضمیری مرفوعی متحرک موقتضی سکونی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان ساکن کرد، گەڕا بە نَصَرْتَ.

«نَصَرْتُمَا» بۆ تەثنیەی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی نَصَرْتَ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تەثنیە بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، گەڕا بە نَصَرْتَا جا لەبەر ئەوە کە ئیلتباسی ئەبوو بە مفردی مذکری مخاطبە وە لەکاتی تول‌دان بە فەتحەی (ت) کە یا، هاتین بە دانانی میمێ لە بەینی ئەلف و (ت)کەدا، وە لەبەر ئەوە میمی شفوی موقتضی ضمەی ماقبلەکەی بوو ماقبلەکەمان مضموم کرد گەڕابە نَصَرْتُمَا.

«نَصَرْتُمْ» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی نَصَرْتَ بوو واو ضمیری فاعلی جمعی مذکر بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، لەبەر ئەوە کە واو موقتضی ضمەی ماقبلی خۆی بوو، ماقبلەکەمان مضموم کرد گەڕا بە نَصَرْتُو جا لەبەر ئەوە ئیلتباس ئەبوو بە صیغەی متکلمی وحدە لە کاتی

نَصَرْتِ نَصَرْتُمَا نَصَرْتُنَّ

تول‌دان بە ضمەی (ت) کەی هاتین میمێکی مضمومەمان لەبەینی (ت) واوە کەدا دانا گەڕا بە نَصَرْتُمُوْ، وە لەبەر ئەوە واوی متطرف وە ماقبل مضموم نەبوو بێجگە لەفظی هُوَ نەبێ، وە ئەویش شاذ بوو حەذفی واوەکەمان کرد لەگەڵ ضمەی میمەکەدا گەڕا بە نَصَرْتُمْ.

«نَصَرْتِ» بۆ مفردی مؤنثی موخاطب، ئەصڵەکەی نَصَرَ بوو، (ت)ی مکسورە ضمیری فاعلی مفردی مؤنثی موخاطب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە (ت)ی ضمیر موقتضی سکونی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان ساکن کرد گەڕا بە نَصَرْتِ.

«نَصَرْتُمَا» بۆ تەثنیەی مؤنثی موخاطب ئەصڵەکەی نَصَرْتِ بوو: ئەلف ضمیری فاعل تەثنیە بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە ئەلف موقتضی فتحەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە نَصَرْتَا، جا لەبەر ئەوە ئیلتباسی بوو بە مفردی مذکری موخاطبە وە لەکاتی تول دان بە فتحەی (ت) کەیا هاتین بە میمێکی مفتوحە لە بەینی تێ و ئەلفەکەدا، وە میم موقتضی ضمەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مضموم کرد گەڕا بە نَصَرْتُمَا.

«نَصَرْتُنَّ» بۆ جەمعی مؤنثی موخاطب ئەصڵەکەی نَصَرْتِ بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنث بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە نَصَرْتِنَ، جا دوو عەلامەتی تأنیث گرد بوونەوە، ئەمەش نابار بوو. وە دروست نەبوو حەذفی نونەکە بکەین، چۆنکە دەلالەتی ئەکرد لەسەر جەمعیەت و تأنیث، وە دروستیش نەبوو حەذفی (ت)بکەین چۆنکە

**نَصَرْتُ نَصَرْنٰا وَقِسْ عَلىٰ هٰذٰا فَعْلَلَ وَ تَفَعْلَلَ وَ اَنْـفَعَلَ وَ اسْـتَفْعَلَ وَ تَفَعْلَلَ**

---

ئیلتباسی ئەبوو بە جەمعی مؤنثی غائبەوە، ناچار هاتین بە میمێکی ساکنە لە بەینی (ت) و نونەکەدا گەڕا بە نَصَرْتُمْنَ، جا لەبەر ئەوە میم و نون نزیکی یەک بوو لەمەخرە جا قەلبی میمەکەمان کرد بە نون، وە دەغممان کرد لە نونە ضمیرەکەدا گەڕا بە نَصَرْتُنَّ.

«نَصَرْتُ» بۆ متکلمی وحدە ئەصڵەکەی نَصَرَ بوو، (ت) مضمومە کە ضمیری فاعلی متکلمی وَحْدَهُ بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە (ت)ی ضمیر موقتضی سکونی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان ساکن کرد گەڕا بە نَصَرْتُ.

«نَصَرْنٰا» بۆ متکلمی مع‌الغیر نا عەلامەتی متکلمی مع‌الغیر بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە ضمیری متکلم موقتضی سکونی ماقبلی بوو، ماقبل‌مان ساکن کرد گەڕا بە نَصَرْنٰا.

«**وَقِسْ عَلىٰ هٰذٰا فَعْلَلَ وَ تَفَعْلَلَ وَ اِنْفَعَلَ وَ اِسْتَفْعَلَ وَ تَفَعْلَلَ**» قیاس بکە لەسەر نَصَرَ لە دروستکردنی ئەو چواردە صیغەدا، ئەو فعلانە کە موزونن بەم وەزنانە وە غەیری ئەوانیش لە فعلە ماضی‌یەکان دروست کردنیان ئاسانە و ڕوناک بۆ تالبی فامیدە و چالاک...

جا لەبەر ئەوە لەم شوێنا ڕەخنەگر ووتی: ـ ئەی مصنف تۆ بڕیارت داکە فعلی بنا فاعلی ماضی ئەوەیە، کە حەرفی ئەوەڵی یا ئەوەڵ متحرک لەودا مفتوح بێت ئێستە چی ئەکەیت لە وێنەی اِنْفَعَلَ و اِفتَعَلَ کە ئەمانە فعلی بنا فاعلی ماضین، وە ئەوەڵ حەرفی ئەوان هەمزەیە و ئەویش مکسورە؟

وَ لاٰ تَعْتَبِرْ بِحَرَكٰاتِ الْأَلِفٰاتِ فِي الْأَوٰائِلِ فَإِنَّهٰا زٰائِدَةٌ تَثْبُتُ فِي الْإِبْتِدٰاءِ وَ تَسْقُطُ فِي الدَّرْجِ

مصنف بۆ جوابی ئەم رەخنە فەرمووی: ـ «وَ لاٰ تَعْتَبِرْ بِحَرَكٰاتِ الْأَلِفٰاتِ فِي الْأَوٰائِلِ» ئیعتبار مەکە بە حەرەکەو سەرو ژێرو بۆری ئەو هەمزانە کەوان لە ئەوەڵی فعلە ماضی‌یە مزید فیەیەکان، وەکو: افتعل و استفعل و احرنحم وە وێنەی ئەوانە «فَإِنَّهٰا زٰائِدَةٌ تَثْبُتُ فِي الْإِبْتِدٰاءِ وَ تَسْقُطُ فِي الدَّرْجِ» چۆنکە ئەو هەمزانە هێنراون بۆ دفعی ابتدا بە ساکن، هەر ئەوەندە ئەمیننەوە کە لە ئەوەڵی کلمەوە بن. وە مادام شتێ کەوتە پێشیانەوە نامێنن کە واتە: لە جوملەی حروفی موعتبەرەی کلمە ناناسرێن، وە ئیعتبار بە حەرەکەکانیان نیە. وە لەو فعلانەو وێنەی ئەواندا ئیعتبار بە یەکەم متحرک ئەکرێت کە لەپاش همزەکەوە بێ، وەکو (ت) تێ ی اجتمع،وە (ق) قافی انقطع، وە (ر) إِحْرَنْجم.

# الفعل الماضي ـ المبنيّ لِلْمفعول

وَ الْمَبْنِيُّ لِلْمَفْعُولِ مِنْهُ وَ هُوَ الَّذِي لَمْ يُسَمَّ فاعلُه مٰا كٰانَ أَوَّلُهُ مَضْمُوماً كَفُعِلَ و فُعْلِلَ وَ أُفْعِلَ وَ فُوعِلَ وَ تُفُوعِلَ أَوْ كٰانَ أَوَّلُ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَضْمُوماً (نحو أُفْتُعِلَ وَ اسْتُفْعِلَ)

---

جا پاش باسی بنا فاعل لە فعلی ماضی مصنف دەستی کرد بە باسی بنا مفعولەکەی وە فەرمووی:

«وَ الْمَبْنِيُّ لِلْمَفْعُولِ مِنْهُ» فعلی بنامفعول لە فعلی ماضی: «وَ هُوَ الَّذِي لَمْ يُسَمَّ فاعلُه» کە بە پێی مەعنا ئەو فعلەیە کە ناوی فاعلەکەی نەبرا بێ. یا لەبەر گەورەیی یا لەبەر بچوکی و بێنرخی یا لەبەر نەزانراوی «مٰا كٰانَ أَوَّلُهُ مَضْمُوماً» ئەوە بە پێی لفظ. ئەو فعلەیە کە ئەوەڵ حەرف لەودا مضموم بێ.

«كَفُعِلَ وَ فُعْلِلَ وَ أُفْعِلَ وَ فُوعِلَ وَ تُفُوعِلَ» وەکوو ئەو فعلانە کە موزونن بەم میزانانە وەکو: نُصِرَ وَ دُحْرِجَ و أُكْرِمَ و قُوتِلَ و تُبُوعِدَ. «أَوْ كٰانَ أَوَّلُ مُتَحَرِّكٍ مِنْهُ مَضْمُوماً» یا خود ئەوەڵ متحرکی موعتبەر لەوا مضموم بێت (نحو أُفْتُعِلَ وَ اسْتُفْعِلَ) کە ئەوەڵ متحرک موعتبەر لەواندا (ت) تێکەیەوە (ت) تێ کە مضمومە.

جا لەبەر ئەوە پرسیار کرا مادام ئەوەڵ متحرکی موعتبەر مضموم ئەبێ ئیتر هەمزە وەصڵەکە بۆچی مضموم ئەکرێ؟

**وَ هَمْزَةُ الْوَصْلِ تَتْبَعُ هَذَا الْمَضْمُومَ فِي الضَّمِّ وَ مَا قَبْلَ آخِرِهِ يَكُونُ مَكْسُوراً أَبَدَاً نحو نُصِرَ زَيْدٌ أُوسْتُخْرِجَ الْمَالُ.**

---

مصنف وەلامی دایەوەو فەرموی: «**وَ هَمْزَةُ الْوَصْلِ تَتْبَعُ هَذَا الْمَضْمُومَ فِي الضَّمِّ**» یانی همزە وەصڵەکە بە شێوەی ئەصاڵەت وە ئیعتبار بە خۆی مضموم نەکراوە، بەڵکو بە تەبەعیەتی ئەو متحرکە موعتەبەرە وە مضموم ئەبێ. «**وَ مَا قَبْلَ آخِرِهِ يَكُونُ مَكْسُوراً أَبَدَاً**» ئەمە لە جوملەی تعریفی فعلی بنا مفعولی ماضی‌یە، واتە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوەڵ حەرف یا ئەوەڵ متحرکی موعتەبەر لەوا مضموم بێ ئەبێ حەرفی پێش حەرفی ئاخریش مکسور بێ بەدەوام. جا مثالی فعلی بنا مفعولی ماضی کە ئەوەڵ حەرف لەوا مضموم بێ، وە ماقبلە ئاخرەکەیشی مکسور بێ «**نحو نُصِرَ زَيْدٌ**» یانی یارمەتی زەید درا، ئەصڵەکەی **نَصَرَ عَمْرٌو زَيْداً** بوو، عمرو فاعل بوو وە زید **مفعولٌ بِهِ** وە منصوب بوو وە نَصَرَ فعلی بنا فاعل بوو جا نَصَرَمان کرد بە بنامفعول بەم ڕەنگە حەرفی ئەوەڵمان مضموم کرد وە ماقبلە ئاخرەکەمان مکسور کرد، وە عمرو فاعل بوو حذفمان کرد، وە زید کە **مفعولٌ بِهِ** وە منصوب بوو لە جێگەی عمروا دامان ناو مرفوعمان کرد گەڕا بە **نُصِرَ زَيدٌ**. وە مثالی فعلی بنا مفعولی ماضی کە ئەوەڵ متحرکی موعتەبەر لەوا مضموم بێ وەکو: «**أُوسْتُخْرِجَ الْمَالُ**» ئەصڵەکەی **إِسْتَخْرَجَ السَّارِقُ الْمَالَ** بوو، یانی دز ئەو ماڵەی دەرکردبوە دەرەوە.

إِسْتَخْرَجَ فعلی بنا فاعل بوو، وە سارق فاعل وە مرفوع بوو، وە مال **مفعولٌ بِهِ** وە منصوب بوو جا إِستَخْرَجَمان گۆڕی بە فعلی بنامفعول، بەم

..............................................................

جۆرە ئەوەڵ متحرکی موعتەبەر لەوداکە (ت)تی مەبوو مضمومان کرد، وە همزە وەصڵەکەشمان بە تەبەعیەتی (ت) تێ کەوە مضموم کرد، وە ماقبلی ئاخرەکەیمان مکسور کرد، وە سارق فاعل بوو حەذفمان کرد، وەماڵ کە مفعولٌ بِهِ وە منصوب بوو لە جێگەی ئەو دامان ناو مرفوعمان کرد گەڕا بە أُسْتُخْرِجَ الْمَالُ.

جا لە کاتێکدا مصنف رحمه الله ڕزگار بوو لە تصریفاتی فعلی ماضی کە یەکێکە لەو مثالانە کە پەیدا ئەبن لە ئەصڵی واحد کە مصدەری مجردە، دەستی کرد بە باسی فعلی مضارع کە ئەویش یەکێکە لەو مثالانە کە بە هۆی فعلی ماضیەوە لە مصدەری مجرد دروست ئەکرێ وە فەرموی: ـ

# الفعل المضارع

وَ أَمَّا الْمُضٰارِعُ فَهُوَ مٰا كٰانَ اَوَّلُهُ اِحْدَى الزَّوٰائِدِ الْأَرْبَعِ وَ هِيَ: الْهَمْزَةُ وَ النُّونُ وَالْيٰاءُ وَ التّٰاءُ وَ تَجْمَعُهٰا أَنَيْتَ أَوْ أَتَيْنَ أَوْ نَأْتِي فَالْهَمْزَةُ لِلْمُتَكَلِّمِ وَحْدَهُ، وَ النُّونُ لَهُ إِذٰا كٰانَ مَعَهُ غَيْرُهُ وَ التّٰاءُ لِلْمُخٰاطَبِ مُفْرَداً أَو مُثَنّىً أَو مَجْمُوعاً مُذَكَّراً كٰانَ أَو مُؤَنَّثاً وَ لِلْغٰائِبَةِ الْمُفْرَدَةِ وَ لِمُثَنّٰاهٰا

---

«وَ أَمَّا الْمُضٰارِعُ فَهُوَ مٰا كٰانَ اَوَّلُهُ اِحْدَى الزَّوٰائِدِ الْأَرْبَعِ» وە ئەمما فعلی مضارع ئەو فعلەیە کە لە ئەوەڵیەوە ببێ یەکێ لە چوار حروفی زائدە.

«وَ هِيَ: الْهَمْزَةُ وَ النُّونُ وَالْيٰاءُ وَ التّٰاءُ» وە ئەوانیش عیبارەتن لە همزە و (أ) نون و (ن) یێ و (ی) تی (ت). «وَ تَجْمَعُهٰا أَنَيْتَ أَوْ أَتَيْنَ أَوْ نَأْتِي» ئەو چوار حەرفەگرد ئەکاتەوە یەکی لەم لەفظانە «فَالْهَمْزَةُ لِلْمُتَكَلِّمِ وَحْدَهُ، وَ النُّونُ لَهُ إِذٰا كٰانَ مَعَهُ غَيْرُهُ» جا همزە کراوە بە نیشانە بۆ متکلمی وحدهٗ، یانی همزە کراوە بە عەلامەت بۆ متکلم وحدە وەکو أَكْتُبُ.

وە نون (ن) دانراوە بۆ متکلم لە کاتێکدا غەیری لەگەڵدا بێ وەکو نَكْتُبُ.

«وَ التّٰاءُ لِلْمُخٰاطَبِ مُفْرَداً أَو مُثَنّىً أَو مَجْمُوعاً مُذَكَّراً كٰانَ أَو مُؤَنَّثاً وَ لِلْغٰائِبَةِ الْمُفْرَدَةِ وَ لِمُثَنّٰاهٰا». یانێ (ت) تێ دانراوە بۆ عەلامەتی موخاطب مفرد بێ یا تثنیە یا جمع مذکر بێ یا مؤنث، وە هەم دانراوە بە عەلامەت بۆ مفردەی مؤنثی غائب وە تثنیەی مؤنثی، غائب. وەکو: ـ

وَ الْيَاءُ لِلْغَائِبِ الْمُذَكَّرِ مُفْرَداً أَو مُثَنّىً أَو مَجْمُوعاً وَ لِجَمْعِ الْـمُؤَنَّثِ الْغَائِبِ وَ هُوَ يَصْلُحُ لِلْحَالِ وَ الْإِسْتِقْبَالِ وَ تَقُولُ يَفْعَلُ الْآنَ وَ يُسَـمَّى حَالاً وَ حَاضِراً

---

تَكْتُبُ، تكتبان، تكتبون، تكـتبين، تكـتبان، تكـتبن، صيغەكـانی مخاطب وه هند تكتب و الهندان تكتبان، صيغەكانی غائب.

«وَ الْيَاءُ لِلْغَائِبِ الْمُذَكَّرِ مُفْرَداً أَو مُثَنّىً أَو مَجْمُوعاً وَ لِجَمْعِ الْمُؤَنَّثِ الْغَائِبِ» یانی (ی) یی دانراوه بە عەلامەتی غائب مذكر، مفرد بێ یا مثنی یا جمع وەكو: ـ يَكْتُبُ، يَكْتُبَانِ، يَكْتُبونَ

وه بو جەمعی مؤنثی غائب وەكو: ـ يَكْتُبْنَ.

«وَ هُوَ يَصْلُحُ لِـلْحَالِ وَ الْإِسْـتِقْبَالِ» فـعلی مـضارع ئـەگـونجێ بـۆ دەلالەت كردن لەسەر زەمانی حاڵ كە ئێستەیە، وه زەمانی ئُستقبال كە پاش زەمان ئێستەیە. كە وابێ هەر كاتێ فعلی مضارع ڕوت بوو لە لفظێ كە یەكێ لەو دو زەمانە بگەیەنێ ئەوه مشتر كە لەبـەینی ئـەوانـا، وه بـۆ هـەردویان دەست ئەدات.

«وَ تَقُولُ يَفْعَلُ الْآنَ» واتە مادام فعلی مضارع مشتر كە لەبەینی حاڵ و ئُستقبالا ئەتوانی مقیّدی بكەی بە لفظی (الان) بو ئەوەكە تەنیا زەمانی حاڵ بگەیەنی و بەس.

«وَ يُسَمَّى حَالاً وَ حَاضِراً» وه ئەو فعله مـضارعه كـه مـقیّد ببێ بـه وێنەی اَلْآنَ ناو ئەبرێ بە فعلی حاڵ وه بە فعلی حازر بنا لەسەر ئەوه كـه حـــاڵ وه حـــازر مــەعنایان یــەكـێكە، وه لەلای بــازێ لە زانــاكــان

**وَ يَفْعَلُ غَداً وَ يُسَمَّى مُسْتَقْبَلاً وَ إِذَا أَدْخَلْتَ عَلَيْهِ السِّينَ أَوْ سَوْفَ فَقُلْتَ: سَيَفْعَلُ أَوْ سَوْفَ يَفْعَلُ اخْتصَّ بِزَمَانِ الْأِسْتِقْبَالِ.**

---

ئەم دو لفظە فەرقیان هەیە، وە حاڵ بۆشتێ ئەوترێ کە لە پێش چاوا بێ. وە فعلی حازر فعلێکە کە لە کاتێ قسەدا ببێ خوای لە پێش چاوا بێ یا نە.

«**وَ يَفْعَلُ غَداً**» عەطفە لەسەر قەولی مصنف کە فەرموی: **يَفْعَلُ الْآنَ** یانی ئەتوانی فعلی مضارع مقیّد بکەی بە زەمانی داهاتووە وە بە واسطەی لفظێ وەکو **غَداً** بەم جۆرە بڵێ: یفعل غداً یانی کار ئەکا سبەینی.

«**وَ يُسَمَّى مُسْتَقْبَلاً**» وە لەم کاتا کە مقیّد بێ بەو قەیدەوە کە کاتی داهاتو بگەیەنی ئەو فعلە مضارعە ناو ئەبرێ بە فعلی مستقبل، واتە فعلی زەمانی ڕوتێ کراو، وە لە حەقیقەتا زەمانە ڕوو ئەکاتە ئێمە وە قیاس وایە بڵێی مستقبل بە کسرەی (ب) بێ.

«**وَ إِذَا أَدْخَلْتَ عَلَيْهِ السِّينَ أَوْ سَوْفَ فَقُلْتَ: سَيَفْعَلُ أَوْ سَوْفَ يَفْعَلُ اخْتصَّ بِزَمَانِ الْأِسْتِقْبَالِ**» وەکاتێ کە حرفی سین (س) یا لفظی سوف بخەیتە سەر فعلی مضارع، وە بڵێت: **سَيَفْعَلُ فُلَانٌ** یا سوف یفعل ئەوە ئەو فعلە مضارعە ئەبەسترێ بە زەمانی ئیستقباڵەوە.

والحاصڵ فعلی مضارع لە ذاتی خۆیا مشترکە لە بەینی زەمانی حاڵ و ئیستقباڵدا وە بۆ هەردوکیان دەست ئەدات، بەڵام کاتێ کە لەگەڵ لفظێکدا بێت بۆ حاڵ بێ فەقەت یا بۆ ئستقباڵ بێ فەقەت ئەوە لەو کاتا موختەس ئەبێ بەو زەمانەوە.

## المبنى للفاعل من المضارع

فَالْمَبْنِیُّ لِلْفاعِلِ مِنْهُ ما کَانَ حَرْفُ الْمُضارِعَةِ مِنْهُ مَفْتُوحاً اِلاَّ ما کٰانَ ماضِیهِ عَلیَ أَرْبَعَةِ أَحُرفٍ فَإِنَّ حَرْفَ الْمُضارِعَةِ مِنْهُ یَکُونُ مَضْمُوماً أَبَداً نحو یُدَحْرِجُ وَ یُکْرِمُ و یُفرِّحُ وَ یُقاتِلُ وَ عَلامَةُ بِناءِ هٰذِهِ الْأَرْبَعَةِ لِلْفاعِلِ کَوْنُ الْحَرْفِ الَّذِی قَبْلَ آخِرِهِ مکسوراً ابداً.

---

جا فعلی مضارعیش وەکو فعلی ماضی بنافاعل وە بنا مفعولی هەیە. وە مصنف بۆ بەیانی ئەمە فەرموی: «فَالْمَبْنِیُّ لِلْفاعِلِ مِنْهُ» یانی فعلی بنافاعل لە فعلی مضارع بە پیٚی مەعنا ئەوەیە کە ناوی فاعلەکەی برابیٚ وە بە پیٚی لفظ: «ما کَانَ حَرْفُ الْمُضارِعَةِ مِنْهُ مَفْتُوحاً» فعلیٚکی وایە کە حەرفی مضارع لەودا مفتوح بیٚ وەکو: ـ یَنْصُر و یَضْرِبُ. «اِلاَّ ما کٰانَ ماضِیهِ عَلیَ أَرْبَعَةِ أَحُرفٍ فَإِنَّ حَرْفَ الْمُضارِعَةِ مِنْهُ یَکُونُ مَضْمُوماً أَبَداً» ئیلا فعلە مضارعیٚکی وا کە ماضییەکەی لەسەر چوار حەرف بیٚ، ئەوە حەرفی مضارع لەودا مضموم ئەبیٚ بە دەوام چ بنافاعل وە چ بنامفعول بیٚ. «نحو یُدَحْرِجُ وَ یُکْرِمُ و یُفرِّحُ وَ یُقاتِلُ» ئەمانە حەرفی مضارعیان بە دەوام مضمومە.

جا کەسیٚ بلیٚت لەم چوار فعلانە فەرقی بنافاعل و بنامفعول چییە؟ لە جوابیا ئەلیٚت: «وَ عَلامَةُ بِناءِ هٰذِهِ الْأَرْبَعَةِ لِلْفاعِلِ کَوْنُ الْحَرْفِ الَّذِی قَبْلَ آخِرِهِ مکسوراً ابداً. نیشانەی دروست کردنی ئەم چوار بابانە بۆ

مِثالُهُ مِنْ يَفْعُلُ يَنْصُرُ يَنْصُرانِ يَنْصُرُونَ تَنْصُرُ تَنْصُرانِ

صیغەی بنافاعل ئەوەیە ئەو حەرفە وا لە پێش حەرفە ئاخرەکەیانەوە مکسور بێ بە دەوام.

بەڵام لە بنا مفعولەکانیاندا مفتوح ئەبێ بە دەوام. «مِثالُهُ مِنْ يَفْعُلُ» جا مثالی فعلی بنافاعل مضارع لە موزونٌبِهِ بە فعلی «يَنْصُرُ» بۆ مفرەدی مذکری غائب، کە حەرفی مضارع لەوا مفتوحە. ئەصڵەکەی نَصَرَ بو (ی) یێ نیشانەی فعلی مضارع بۆ لە ئەوەڵیەوە دامان نا، فاءالفعلەکەمان ساکن کرد عین‌الفعلەکەمان مضموم کرد لام‌العفلەکەمان مرفوع کرد گەڕا بە يَنْصُرُ.

«يَنْصُرانِ» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی مثنی بوو، (ن) نون عەلامەتی ئیعراب بوو ئیڵحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە يَنْصُران.

«يَنْصُرُونَ» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُ بوو، واو ضمیری فاعلی جمعی مذکر بوو، وە (ن) نون عەلامەتی ئیعراب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە يَنْصُرُونَ.

«تَنْصُرُ» بۆ مفردی مؤنثی غائب ئەصڵەکەی يَنْصُرُ بوو (ی) یێ کەمان گۆڕی بە (ت) تێ بوبە تَنْصُرُ.

«تَنْصُرانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُ بوو ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو لە ئەفعالا، وە (ن) کە عەلامەتی ئیعراب بوو

يَنْصُرْنَ تَنْصُرُ تَنْصُرَانِ تَنْصُرُونَ تَنْصُرِينَ تَنْصُرَانِ

ئيلحاقمان كردن به ئاخريه‌وه گه‌ڕا به تَنْصرانِ.

«يَنْصُرْنَ» بۆ جه‌معی مؤنثی غائب ئه‌صڵه‌كه‌ی تَنْصُرُ بوو، تەبديلی (ت) تیمان كرد به (ی) یی وه نون ضميری فاعلی جمعی مؤنث بوو ئيلحاقمان كرد به ئاخريه‌وه، وه نونی ضمير موقتضی سكونی ماقبلی بوو، ماقبله‌كه‌مان ساكن كرد گه‌ڕا به يَنْصُرْنَ.

يَنْصُرُ، يَنْصُرانِ، يَنْصُرونَ، تَنْصُرُ، تَنْصران، يَنْصُرنَ ـ صيغه‌كانی غائب.

«تَنْصُرُ» بۆ مفردی مذكری مخاطب ئه‌صڵه‌كه‌ی يَنْصُرُ بوو، تبديلی (ی) یی‌كه‌مان كرد به (ت) تیٚ گه‌ڕا به تَنْصُرُ.

«تَنْصُرانِ» بۆ تثنيه‌ی مذكری مخاطب، ئه‌صڵه‌كه‌ی تَنْصُرُ بوو، ئه‌لف ضميری فاعلی تثنيه بوو، وه (ن) نون عه‌لامه‌تی ئيعراب بوو ئيلحاقمان كرد به ئاخريه‌وه گه‌ڕا به تَنْصُرانِ.

«تَنْصُرُونَ» بۆ جه‌معی مذكری مخاطب ئه‌صڵه‌كه‌ی تَنْصُرُ بوو، واو ضميری فاعلی جمعی مذكر بووه، وه (ن) نون عه‌لامه‌تی ئيعراب بوو ئيلحاقمان كرد به ئاخريه‌وه گه‌ڕا به تَنْصرُونَ.

«تَنْصُرِينَ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب ئه‌صڵه‌كه‌ی تَنْصُرُ بوو، (ی) یێ ضميری فاعلی مفردی مؤنثی مخاطب بوو وه (ن) نون عه‌لامه‌تی ئيعراب بوو ئيلحاقمان كرد به ئاخريه‌وه، وه (ی) یێ موقتضی كسره‌ی ماقبلی بوو، ماقبله‌كه‌مان مكسور كرد گه‌ڕا به تَنْصرِينَ.

«تَنْصُرانِ» بۆ تثنيه‌ی مؤنثی مخاطب ئه‌صڵه‌كه‌ی تَنْصُرِينَ بوو، ئه‌لف

## تَنْصُرْنَ أَنْصُرُ نَنْصُرُ

ضمیری فاعلی تثنیه بوو ئیلحاقمان کرد به ئاخریەوە، پاش حەذفی (ی) یێ فاعلی مفردی مؤنث، ئەلف موقتضی فتحەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مفتوح کرد وە تەبدیلی فەتحەی نونی ئیعرابەکەمان کرد بە کەسەرە لەبەر موافقەی باقی تثنیەکان گەڕا بە تَنْصُرَانِ.

«تَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب ئەصڵەکەی تَـنْصُرِينَ بوو، حەذفی عەلامەتی مفردی مؤنثمان کرد لەگەڵ نونی ئیعرابا، وە (نون) ضمیری فاعلی جەمعی مؤنثی مخاطب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، نونی ضمیر موقتضی سکونی ماقبلی بوو، ماقبلەکەمان ساکن کرد گەڕا بە تَنْصُرْنَ.

تَنْصُرُ، تَنْصُرَانِ، تَنْصُرُونَ، تَنْصُرِينَ، تَـنْصُرَانِ، تَـنْصُرْنَ، صیغەکانی مخاطب.

«أَنْصُرُ» بۆ متکلمی وحدە، ئەصڵەکەی یَـنْصُرُ بوو تبدیلی (ی) یێکەمان بە همزەی مفتوحە گەڕا أَنصر.

«نَنْصُرُ» بۆ متکلمی مع‌الغیر، ئەصڵەکەی ینصر بوو، تبدیلی (ی) یێکەمان کرد بە (ن) نون گەڕا بە نَنْصُرُ.

أَنْصُرُ، نَنْصُرُ، صیغەکانی متکلم.

وَ قِسْ عَلَى هٰذا يَضْرِبُ وَ يَعْلَمُ وَ يُدَحْرِجُ وَ يُفَرِّجُ وَ يُقَاتِلُ وَ يَتَكَسَّرُ وَ يَتَبَاعَدُ وَ يَنْقَطِعُ وَ يَجْتَمِعُ وَ يَحْمَرُّ وَ يَحْمَارُّ وَ يَسْتَخْرِجُ وَ يَعْشَوْشِبُ وَ يَقْعَنْسِسُ وَ يَسْلَنْقِىٰ وَ يَتَدَحْرَجُ و يَحْرَنْجِمُ وَ يَقْشَعِرُّ

---

تو قیاس بکه لەسەر يَنْصُرُ له دروستکردنی صیغەکانیتر له بنافاعلی مضارعدا «يَضْرِبُ وَ يَعْلَمُ وَ يُدَحْرِجُ وَ يُفَرِّجُ وَ يُقَاتِلُ وَ يَتَكَسَّرُ وَ يَتَبَاعَدُ وَ يَنْقَطِعُ وَ يَجْتَمِعُ وَ يَحْمَرُّ وَ يَحْمَارُّ وَ يَسْتَخْرِجُ وَ يَعْشَوْشِبُ وَ يَقْعَنْسِسُ وَ يَسْلَنْقِىٰ وَ يَتَدَحْرَجُ و يَحْرَنْجِمُ وَ يَقْشَعِرُّ»

# المبنی للمفعول من المضارع

وَ الْمَبْنِيُّ لِلْمَفْعُولِ مِنْهُ مَا كٰانَ حَرْفُ الْمُضٰارِعَةِ مِنْهُ مَضْمُوماً وَ مٰا قَبْلَ آخِرِهِ مَفْتُوحاً أَبَداً نحو: يُنْصَرُ وَ يُدَحْرَجُ وَ يُكْرَمُ و يُفَرَّحُ و يُقٰاتَلُ وَ يُسْتَخْرَجُ وَ اعْلَمْ أَنَّهُ يَدْخُلُ عَلَى الْمُضٰارِعِ (مٰا) وَ (لاٰ) النّٰافِيتٰانِ وَ لاٰ تُغَيِّرٰانِ صِيغَتَهُ

---

«وَ الْمَبْنِيُّ لِلْمَفْعُولِ مِنْهُ» فعلی بنامفعول له فعلی مضارع: «مَا كٰانَ حَرْفُ الْمُضٰارِعَةِ مِنْهُ مَضْمُوماً وَ مٰا قَبْلَ آخِرِهِ مَفْتُوحاً أَبَداً» فعلێکی وەهایە کە حەرفی مضارع لە وا مضموم بێ، وە ماقبلە ئاخرەکەی مفتوح بێ بە دەوام «نحو: يُنْصَرُ وَ يُدَحْرَجُ وَ يُكْرَمُ و يُفَرَّحُ و يُقٰاتَلُ وَ يُسْتَخْرَجُ» ئیستە ئەم فعلانە هەموو فعلی بنامفعول مضارعن هەرکام لەبابی خویا وە حەرفی مضارع لەوانا مضمومە، وە ماقبلە ئاخرەکەیان مفتوحە.

جا ئەصڵی يُنْصَرُ کە بنامفعولە يَنْصُرُ بوو، (ی) یێ حەرفی مضارع بوو مضمومان کرد وە ماقبلە ئاخرەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە يَنْصَرُ، وە هەربەم جۆرەش باقی صیغەکانی تریش.

«وَ اعْلَمْ أَنَّهُ يَدْخُلُ عَلَى الْمُضٰارِعِ (مٰا) وَ (لاٰ) النّٰافِيتٰانِ» تۆ بزانە واقع ئەوەیە داخڵی فعلی مضارع ئەبێت (ما)ی نافیە و (لای) نافیە، «وَ لاٰ تُغَيِّرٰانِ صِيغَتَهُ» بەڵام ئەم دو حرفە صیغەی فعلەکە ناگۆڕن، وە حەذفی

تَقُولُ لاٰ يَنْصُرَ، لاٰ يَـنْصُرٰانِ، لاٰ يَـنْصُروُنَ، لاٰ تَـنْصُرَ، لاَ تَـنْصُرٰانِ، لاٰ يَنْصُرْنَ، لاَ تَنْصُرُ، لاَ تَنْصُرٰانِ، لاَ تَنْصُرُونَ، لاَ تَنْصُرِينَ، لاَ تَنْصُرٰانِ، لاَ تَنْصُرْنَ، لاَ أَنْصُرُ، لاَنَنْصُرُ.

## المضارع المجزوم

## وَ أَنَّهُ يَدْخُلُ عَلىَ الْفِعْلِ الْمُضٰارِعِ الْجٰازِمُ فَيَحْذِفُ حَرَكَةَ الْوٰاحِدِ

---

هیچی لێ ناکەن نە حرکە وە نە حەرف، بەڵام مەعناکەی ئەگۆڕن لە ئثباتەوە بۆ نەفی، وە لە بوونەوە بۆ نەبوون. «تَـقُولُ لاٰ يَـنْصُرُ، لاٰ يَـنْصُرٰانِ، لاٰ يَنصرون، لاٰ تَنْصُرُ، لاَ تَنْصُرٰانِ، لاٰ يَنْصُرْنَ، لاَ تَنْصُرُ، لاَ تَـنْصُرٰانِ، لاَ تَنْصُرُونَ، لاَ تَنْصُرِينَ، لاَ تَنْصُرٰانِ، لاَ تَنْصُرْنَ، لاَ أَنْصُرُ، لاَنَنْصُرُ».

ئەصڵی (لاٰ يَنْصُرُ) يَنْصُر بوو، مثبت بوو لای نافیەمان داخڵ کردە سەر عەمەلی نەکرد لە لفظا، بەڵام عەمەلی کرد لە مەعناکەیاکە مثبت بوو کردی بە منفی بۆیە لاٰ يَنْصُرُ، وە باقی صیغەکانیش لەسەر قیاسی لاینصر باس ئەکرێن.

«وَ أَنَّهُ يَدْخُلُ عَلىَ الْفِعْلِ الْمُضٰارِعِ الْجٰازِمُ» بزانە کە شأن و حاڵ وایە داخڵ ئەبێتە سەر فعلی مضارع عاملی جازم وەکو: لم وەلمّا وە لامی ئەمر وە لای ناهیە وە اِنْ وە مٰا وە باقی کەلیماتی شەرت.

«فَيَحْذِفُ حَرَكَةَ الْوٰاحِدِ» وە ئەو عاملە جازمە حەذفی حەرەکەی مفرەدی مذکر ئەکا لە غائب و مخاطب و متکلم.

وَ الْواحِدَةِ وَ نُونَ التَّثْنِيَةِ وَ الْجَمْعِ المُذَكَّرِ وَ الْواحِدَةِ الْمُخاطَبَةِ وَ لاَ يَحْذِفُ نُونَ جَماعَةِ الْمُؤَنَّثِ فَإِنَّهُ ضَمِيرٌ كَواوِ جَمْعِ الْمُذَكَّرِ فَتَثْبُتُ عَلَى كُلِّ حالٍ تقول: لَمْ يَنْصُرْ لَمْ يَنْصُرا

---

«وَ الْواحِدَةِ» وە حەذفی حەرەکەی مفرەدی مؤنثی غائبیش ئەکا «وَ نُونَ التَّثْنِيَةِ وَ الْجَمْعِ المُذَكَّرِ وَ الْواحِدَةِ الْمُخاطَبَةِ» وە حەذفی نونی تثنیە و جەمعی مذکری غائب و مخاطب وە نونی مفردی مؤنث مخاطبیش ئەکات «وَ لاَ يَحْذِفُ نُونَ جَماعَةِ الْمُؤَنَّثِ فَإِنَّهُ ضَمِيرٌ كَواوِ جَمْعِ الْمُذَكَّرِ فَتَثْبُتُ عَلَى كُلِّ حالٍ» بەڵام حەذفی نونی جەمعی مؤنث ناکا چە غائب چە مخاطب، چۆنکی ئەو نونە ضمیری فاعلە وەکوو واوی جەمعی مذکری غائب وە مخاطب. وە ئەمێنێتەوە بە دەوام عاملی لەسەر بێ یا نە «تقول: لَمْ يَنْصُرْ» تۆ ئەڵێت لەکاتی داخڵ بوونی عاملی جازم لەسەر يَنْصُرُ لَمْ يَنْصُرْ بە جەزمەی لامالفعل، ئەصڵکەی يَنْصُرُ بوو مثبت بوو، لَمْ کە عاملی جازمە بوو داخڵمان کردە سەری عەمەلی کرد لە لفظا ئاخرەکەی مەجزوم کرد بە حەذفی حەرەکە، وە عەمەلی کرد لە مەعنادا بەم ڕەنگە مەعناکەی کە مثبت بوو نەفی کرد، لەپاش نقڵکردنی لەزمانی حاڵ و ئیستقباڵە وە بۆ زەمانی ماضی گەڕا بە لَمْ يَنْصُرْ.

«لَمْ يَنْصُرا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرانِ بوو، مثبت بوو، لَمْ کە عاملی جازم بوو داخڵمان کردە سەری عەملی کرد لە لفظا حەذفی نونەکەی کرد، وە عەمەلی کرد لە مەعنایشا بەم ڕەنگە مەعناکەی کە مثبت بوو نەفی کرد، لەپاش نقڵی کە حاڵ و ئیستقباڵە وە بۆلای ماضی گەڕا بە لَمْ يَنْصُرا.

## لَمْ يَنْصُرُوا لَمْ تَنْصُرْ لَمْ تَنْصُرَا لَمْ يَنْصُرْنَ لَمْ تَنْصُرْ لَمْ تَنْصُرَا

«لَمْ يَنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذكری غائب ئەصڵەكەی يَنْصُرُونَ بوو، مثبت بوو، عاملی جازمەمان داخڵ كردە سەری، حەذفی نونەكەی كرد، وە نفی مەعناكەی كرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ يَنْصُرُوا.

«لَمْ تَنْصُرْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵەكەی تَنْصُرُ بوو مثبت بوو، عاملی جازمەمان داخڵ كردە سەری حەذفی حەرەكەی كرد وە نفی مەعناكەی كرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرْ.

«لَمْ تَنْصُرَا» بۆ تثنيەی مؤنثی غائب ئەصڵەكەی تَنْصُرَانِ بوو مثبت بوو عاملی جاذمەمان داخڵ كردە سەری حەذفی نونەكەی كرد و نەفی مەعناكەی كرد لەماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرَا.

«لَمْ يَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب ئەصڵەكەی يَنْصُرْنَ بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخل كردە سەری عەمەلی نەكرد لە لفظا چونكی نون ضميری فاعلە و حذف ناكرێ بەڵام عەمەلی كرد لە مەعنادا بەم ڕەنگە نەفی مەعناكەی كرد لە ماضی داگەڕا لە لَمْ يَنْصُرْنَ.

«لَمْ تَنْصُرْ» بۆ مفردی مذكری مخاطب ئەصڵەكەی تَنْصُرُ بوو، مثبت بوو عاملی جازممان داخل كردە سەری عەمەلی كرد لە لفظا و حەذفی حەرەكەی ئاخرەكەی وە نەفی مەعناكەی كرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرْ.

«لَمْ تَنْصُرَا» بۆ تثنيەی مذكری مخاطب، ئەصڵەكەی تَنْصُرَانِ بوو مثبت بوو، عاملی جازممان داخل كردە سەری حەذفی نونەكەو نفی مەعناكەی كرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرَا.

# لَمْ تَنْصُرُوا لَمْ تَنْصُرِی لَمْ تَنْصُرَا لَمْ تَنْصُرْنَ لَمْ أَنْصُرْ لَمْ نَنْصُرْ

«لَمْ تَنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرون بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکەو نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرُوا.

«لَمْ تَنْصُرِی» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرِینَ بوو مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکەو نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرِي.

«لَمْ تَنْصُرَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرَان بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکە و نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ تَنْصُرَا.

«لَمْ تَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرنَ بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری عەمەلی نەکرد لە لفظا، چۆنکی نون ضمیری فاعلە و حذف ناکری، بەڵاّم عەمەلی کرد لە مەعنادا بەم ڕەنگە نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لم تَنْصُرْنَ.

«لَمْ أَنْصُرْ» بۆ متکلمی وحدە، ئەصڵەکەی أَنْصُرُ بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری، حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی کرد، وە نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ أَنْصُرْ.

«لَمْ نَنْصُرْ» بۆ متکلمی مع‌الغیر، ئەصڵەکەی نَنْصُرُ بوو، مثبت بوو، عاملی جازممان داخڵ کردە سەری، حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی کرد، وە نفی مەعناکەی کرد لە ماضی داگەڕا بە لَمْ نَنْصُرْ.

## المضارع المنصوب

وَ اَنَّهُ يَدْخُلُ عَلَى الْفِعْلِ الْمُضٰارِعِ النّٰاصِبُ فَيُبَدِّلُ مِنَ الضَّمَةِ فَتْحَةً وَ يُسْقِطُ النُّونٰاتِ سِوٰى نُونِ جَمْعِ الْمُؤَنَّثِ لِأَنَّهُ ضَمِيرٌ كَالْوٰاوِ فِي جَمْعِ الْمُذَكَّرِ تقول: لَنْ يَنْصُرَ لَنْ يَنْصُرٰا

---

«وَ اَنَّهُ يَدْخُلُ عَلَى الْفِعْلِ الْمُضٰارِعِ النّٰاصِبُ» وه بزانن شأن و حاڵ وايه داخڵ ئه‌بێته سه‌ر فعلی مضارع عاملی ناصبه وه‌كوو: ـ أَنْ، لَنْ، كَيْ، اِذَن «فَيُبَدِّلُ مِنَ الضَّمَةِ فَتْحَةً» جا ئه‌و عامله ناصبه عه‌مه‌ل ئه‌كات له لفظا بەم ڕه‌نگه ضمه‌ی ئاخری مفرده‌كان ئه‌گۆڕی به فتحه. «وَ يُسْقِطُ النُّونٰاتِ» وه هه‌موو نونه‌كانی ئاخری فعله‌كان حذف ئه‌كا «سِوٰى نُونِ جَمْعِ الْمُؤَنَّثِ لِأَنَّهُ ضَمِيرٌ كَالْوٰاوِ فِي جَمْعِ الْمُذَكَّرِ» بێجگه نونی جه‌معی مؤنث نه‌بێ چه غائب چه مخاطب له‌به‌ر ئه‌وه كه ئه‌و نونه ضميری فاعله وه‌كوو واوی جه‌معی مذكری غائب وه مخاطب هه‌ر ئه‌مێنێته‌وه «تقول: لَنْ يَنْصُرَ» جاتۆ ئه‌ڵێيت له‌كاتی داخڵ‌كردنی عاملی ناصبه له‌سه‌ر فعلی مضارع.

«لَنْ يَنْصُرَ» بۆ مفردی مذكری غائب، ئه‌صڵه‌كه‌ی يَنْصُرُ بوو مثبت بوو، عاملی نصبه‌مان داخڵ كرده سه‌ری عه‌مه‌لی كرد له لفظا ته‌بديلی ضمه‌ی كرد به فه‌تحه، وه له معنايشا به‌م ڕه‌نگه نفی معناكه‌ی كرد به تأكيد له مستقبلا گه‌ڕا به لَنْ يَنْصُرَ.

«لَنْ يَنْصُرٰا» بۆ تثنيه‌ی مذكری غائب، ئه‌صڵه‌كه‌ی يَنْصُرٰانِ بوو، مثبت

لَنْ يَنْصُرُوا لَنْ تَنْصُرَ لَنْ تَنْصُرا لَنْ يَنْصُرْنَ لَنْ تَنْصُرَ لَنْ تَنْصُرا

بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نون وە نەفی مەعناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ يَنْصُرا.

«لَنْ يَنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُونَ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نون وە نەفی مەعناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ يَنْصُرُوا.

«لَنْ تَنْصُرَ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری تەبدیلی ضمەی کرد بە فەتحە، وە نەفی مەعناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ تَنْصُرَ.

«لَنْ تَنْصُرا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَنْصُرانِ بوو، مثبت بوو، عاملی نەصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکەو نەفی مەعناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ تَنْصُرا.

«لَنْ يَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب ئەصڵەکەی يَنْصُرْنَ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان، داخڵ کردە سەری عەملی نەکرد لە لفظاوە حەذفی نونەکەی نەکرد، چۆنکی ضمیری فاعل بوو، بەڵام عەملی کرد لەمعنادا وە نفی معناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ يَنْصُرْنَ.

«لَنْ تَنْصُرَ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری، تبدیلی ضمەی کرد بە فتحە، وە نەفی معناکەی کرد بە تأکید لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ تَنْصُرَ.

«لَنْ تَنْصُرا» بۆ تثنیەی مذکری محاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرانِ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکەمان کرد، وە نەفی معناکەی کرد لە مستقبلاگەڕا بە لَنْ تَنْصُرا.

لَنْ تَنْصُرُوا لَنْ تَنْصُرِی لَنْ تَنْصُرَا لَنْ تَنْصُرْنَ لَنْ أَنْصُرَ لَنْ نَنْصُرَ

«لَنْ تَنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُونَ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نون، و نەفی معناکەی کرد گەڕا بە لَنْ تَنْصُرُوا.

«لَنْ تَنْصُرِی» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرِینَ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نون وە نەفی معناکەی کرد گەڕا بە لَنْ تَنْصُرِي.

«لَنْ تَنْصُرَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرَانِ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری حەذفی نون وە نەفی معناکەی کرد گەڕا بە لَنْ تَنْصُرَا.

«لَنْ تَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرْنَ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری عەملی نەکرد لە لفظا، وە حەذفی نونەکەی نەکرد چۆنکی فاعل بوو، بەڵام لە معنادا عەملی کرد وە نەفی مەعناکەی کرد لە مستقبلا گەڕا بە لَنْ تَنْصُرْنَ.

«لَنْ أَنْصُرَ» بۆ موتکلمی وحدە، ئەصڵەکەی أَنْصُرُ بوو مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری تبدیلی ضمەی کرد بە فەتحە، وە نەفی معناکەی کرد گەڕا بە لَنْ أَنْصُرَ.

«لَنْ نَنْصُرَ» بۆ موتکلمی مع‌الغیر، ئەصڵەکەی نَنْصُرُ بوو، مثبت بوو، عاملی نصبەمان داخڵ کردە سەری تبدیلی ضمەی کرد بە فەتحە، وە نەفی معناکەی کرد گەڕا بە لَنْ نَنْصُرَ.

## وَ مِنَ الْجَوازِمِ لامُ الْغائِبِ تَقُولُ لِيَنْصُرْ لِيَنْصُرا لَيَنْصُرُوا لِتَنْصُرْ

«وَ مِنَ الْجَوازِمِ لامُ الْغائِبِ» وە لە عواملی جازمەیە لامی ئەمری غائب، کە فعلی مضارع مجزوم ئەکات بە حەذفی حەرەکەی مفردات، وە نونی تثنیە وە جەمع وە مفردی مؤنثی مخاطب الاّ = بیجگە = لە دو نونی جەمعی مؤنث نەبیّ.

«تَقُولُ لِيَنْصُرْ» بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُ بوو، لامی ئەمرمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە جەزمەی ئاخرەکەی بە حەذفی حەرکە، وە عەملی کرد لە معنادا بەم ڕەنگە ئەو فعلە کە بۆ ئەخبار بوو کردی بە فعلی طلب گەڕا بە لِيَنْصُرْ.

«لِيَنْصُرا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرانِ بوو، لامی ئەمرمان داخل کردە سەری حەذفی نونی ئاخرەکەی کرد، وە لە معنای ئەخبارەوە گویزایەوە بۆ طلب، گەڕا بە لِيَنْصُرا.

«لَيَنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُونَ بوو، لامی ئەمرمان، داخڵ کردە سەری حەذفی نونی کرد، وە معنای فعلەکە لە ئەخبارەوە گۆڕی بۆ طلب، گەڕا بە لِيَنْصُرُوا.

«لِتَنْصُرْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی، تَنْصُرُ بوو، لامی ئەمرمان داخڵ کردە سەری حەذفی حەرەکەی کرد وە معنای فعلەکەی لە ئەخبارەوە گۆڕی بۆ طلب، گەڕا بە لِتَنْصُرْ.

## لِتَنْصُرْا لَيَنْصُرْنَ لِأَنْصُرْ لِنَنْصُرْ

«لِتَنْصُرْا» بۆ تثنيەی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَـنْصُرْانِ بـوو، لامـی ئەمرمان داخڵ کردە سەری حەذفی نونەکەی کرد، وە معناکەی فعلەکەی لە ئەخبارەوە گوڕی بۆ طلب، گەڕا بە لَتَنْصُرْا.

«لَيَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرْنَ بوو، لامـی ئەمرمان داخل کردە سەری، عەملی نەکرد لە لفظا وە نـونەکـەی حـذف نەکرد چۆنکی ضمیری فاعل بوو بەڵام عەملی کرد لە معنادا فعلەکەی لە ئەخبارەوە گۆڕی بۆ طلب گەڕا بە لِيَنْصُرْنَ.

«لِأَنْصُرْ» بۆ موتکلمی وحدە، ئەصڵەکەی أَنْصُرُ بوو، لامی ئـەمرمان داخڵ کردە سەری حەذفی حەرەکەی کرد وە معنای فعلەکەی گـۆڕی لە ئەخبارەوە بۆ طلب گەڕا بە لِأَنْصُرْ.

«لِنَنْصُرْ» بۆ موتکلەمی مع‌الغیر، ئەسڵەکەی نَنْصُرْ بوو، لامی ئەمرمان داخڵ کردە سەری حەزفی حەرەکەی ئاخرەکەی کرد، وە معنای فعلەکەی لە ئەخبارەوە گۆڕی بۆ طلب، گەڕا بە لِنَنْصُرْ.

قەولی مصنف کە فەرمووی: «لام أمر الغائب» بۆ ئیحتیرازە لە داخڵ بوونی لامی ئەمر لەسەر فعلی مـخاطب لە بـنا فـاعل‌دا، وەکـو: لِـتَنْصُرْ، لِتَنْصُرْا لەبەر ئەوە کە ئەمر لە مخاطب صیغەی تیابەتی هەیەکە فعلی أُمر بە صیغەیە وەکوو لە مەولا باسی ئەکەین، بەڵام ئەبێ ئەو مخاطبە کە لامـی ناچێتە سەر فعلی مخاطبی بنافاعل بێ ئەگەرنا لامی ئەمر داخڵ ئەبێتە سەر مخاطبی بنامفعول لەبەر ئەوە کە ئەمری مخاطبی بنامفعوول والە حوکمی ئەمری غائب‌دا.

وَقِسْ عَلَى هٰذَا لِيَضْرِبْ وَ لِيَعْلَمْ وَ لِيُدَحْرِجْ وَ لِيُكْرِمْ وَ لِـيُفَرِّحْ وَ غَيْرَهَا وَ مِنْهَا لا النَّاهِيَةُ تقول لاٰ يَنْصُرْ لاٰ يَنْصُرَا

---

ئێستە لِتُنْصَرْ بە صیغەی بنامفعول والە حوكمی لِيَنْصُرْكَ فلانٌ هـەر وەها داخڵ بوونی لامی ئەمر لەسەر فعلی موتكلم لەبەر ئەوەیە كە ئەمر لە موتكلم والە حوكمی ئەمری غائب‌دا، ئێستە لأنصر والە حوكمی «لِيُطْلُبْ فُلاٰنٌ مِنِّي النَّصْرَ حَتَّى أَنْصُرَهُ» وە لِنَنْصُرْ والە حوكمی «لِيَطلُبْ فلانٌ مِنّا النَّصْرَ حَتَّى نَنْصُرَهُ».

«وَقِسْ عَلَى هٰذَا لِيَضْرِبْ وَ لِيَعْلَمْ وَ لِيُدَحْرِجْ وَ لِيُكْرِمْ وَ لِيُفَرِّحْ وَ غَيْرَهَا» یانی تۆ قیاس بكە لەسەر معاملەی ئەمری غائبی مضارعی بابی ئـەوەڵ، ئـەمری غـائبی ئـەم بـابانە و غـیری ئـەوانیش كـە هـەموو لە دروستكردنا وەكوو یەک وایە.

«وَ مِنْهَا لا النَّاهِيَةُ» لە جوملەی ئەو عـاملانەیە كـە عـەمەلی جـزمە ئەكەن (لا)ی ناهیە كە دانراوە لە بۆ طلبی تەرک لە هەموو فاعلێ غائب بێ یا مخاطب بێ یا موتكلم مذكر بێ یا مؤنث: «تقول لاٰ يَنْصُرْ» جا تۆ ئەڵێی لاٰ يَنْصُرْ بۆ نەهی لە مفردی مذكری غائب ئەصڵەكەی يَـنْصُرُ بـوو لای ناهیەمان داخڵ كردە سـەری عـەملی كـرد لە لفـظا حـەذفی حـەرەكـەی ئاخرەكەی كرد، وە لە معنایشا چۆنكی ئەو فعلەی گۆڕی لە ئەخبارەوە بۆ انشایانی بۆ انشای طلبی فعل لە مفردی مذكری غائب، گەڕا بە لاٰ يَنْصُرْ.

«لاٰ يَنْصُرَا» بۆ تثنیەی مذكری غائب، ئەصڵەكەی يَنْصُرَانِ بوو، لای ناهیەمان داخڵ كردە سەری عەملی كرد لە لفظا كە حەذفی نونەكەی كرد، وە لە مەعنادا فعلەكەی گۆڕی لە ئەخبارەوە بۆ انشای طلبی تەركی فـعل

لاٰ يَنْصُروُا لاٰ تَنصُرْ لاٰ تَنْصُرَا لاٰ يَنصُرْنَ لاٰ تَنْصُرْ

---

گەڕا بە لاٰ يَنْصُرَا.

«لاٰ يَنْصُروُا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرُونَ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی نون، وە لە مەعنادا فعلەکەی گۆڕی لە ئەخبارەوە بۆ انشا گەڕا بە لاٰ يَنْصُرُوا.

«لاٰ تَنْصُرْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی مەعناکەی لە ئەخبارەوە بۆ طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاٰ تَنْصُرْ.

«لاٰ تَنْصُرَا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی تَنْصُرَانِ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی نون، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی مەعناکەی لە ئەخبارەوە بۆ طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لا تَنْصُرَا.

«لاٰ يَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی يَنْصُرْنَ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەمەلی نەکرد لە لفظا بە حەذفی نون لەبەر ئەوە ضمیری فاعل بوو حەذف ناکری، بەلاٰم عەملی کرد لە مەعنادا، مەعناکەی گۆڕی لە ئەخبارەوە بۆ طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاٰ يَنْصُرْنَ.

«لاٰ تَنْصُرْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی لە ئەخبارەوە بۆ طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاٰ تَنْصُرْ.

لاٰ تَنْصُرٰا لاٰ تَنْصُرُوا لاَ تَنْصُرِی لاٰ تَنْصُرٰا لاٰ تَنْصُرْنَ

«لاٰ تَنْصُرٰا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرٰانِ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی نون، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی مەعنای فعلەکە لە ئەخبارەوە بۆ طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاَ تَنْصُرٰا.

«لاٰ تَنْصُرُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرونَ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظ بە حەذفی نونەکەی، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی لە ئەخبارەوە بۆ انشا وە طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لا تَنْصُرُوا.

«لاَ تَنْصُرِی» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرِینَ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی نون، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی لە ئەخبارەوە بۆ انشا گەڕا بە لاٰ تَنْصُرِی.

«لاٰ تَنْصُرٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُران بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی نون، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی مەعناکەی لە ئەخبارەوە بۆ انشاوە طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لا تَنْصُرٰا.

«لاٰ تَنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرْنَ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی نەکرد لە لفظا بە حەذفی نون چۆنکە ضمیری فاعل بوو حذف ناکری، بەڵام عەملی کرد لە مەعنادا بەگۆڕینی لە ئەخبارەوە بو انشاوە طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاَ تَنْصُرْنَ.

## لاٰ أَنْصُرْ لاٰ نَنْصُرْ وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ سٰائِرِ الْأَمْثَلَةِ

«لاٰ أَنْصُرْ» بۆ موتکلمی وحده، ئەصڵەکەی أَنْصُرُ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەملی کرد لە لفظا بە حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی، وە لە مەعنادا بە گۆڕینی مەعنای فعلەکە لە ئەخبارەوە بۆ انشا. وە طلبی تەرک فعل گەڕا بە لاٰ اَنْصُرْ

«لاٰ نَنْصُرْ» بۆ موتکلمی مع‌الغیر، ئەصڵەکەی نَنْصُرُ بوو، لای ناهیەمان داخڵ کردە سەری عەمەلی کرد لە لفظا بە حەذفی حەرەکەی ئاخرەکەی وە لە مەعنادا بە گۆڕینی لە ئەخبارەوە بو انشاء وە طلبی تەرکی فعل گەڕا بە لاَ نَنْصُرْ.

«وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ سٰائِرِ الْأَمْثَلَةِ» وەکوو دارِشتنی صیغەی نەهی وایە لە مضارعی بابی ئەوەڵ یاسای دارِشتنی لە باقی بابەکانا. جا لەبەر ئەوە ئەمر کردن بە فعل بە دو جورە: ـ یەکەم: ئەمرە بە هوی داخڵ کردنی لام لەسەر فعلی مضارع، وە ئەمە ڕابورد. دوهەم: ئەمر کردنە بە گۆڕینی صیغەی فعلی مضارعی مخاطب. مصنف ویستی باسی ئەمەش بکات وە فەرموی: ـ

## أنواع فعل الأمر «الأمر بالصيغة»

وَ أَمّا الْأَمْرُ بِالصّيغَةِ فَهُوَ أَمْرُ الْحاضِرِ وَ هُوَ جارٍ عَلىَ لَفْظِ الْمُضارِعِ الْمَجْزُومِ فِي حَذْفِ الْحَرَكاتِ وَ النُّونِ فَإِنْ كانَ ما بَعْدَ حَرْفِ الْمُضارِعِ مِنْهُ مُتَحَرِّكاً فَتُسْقِطُ مِنْهُ حَرْفَ الْمُضارِعَةِ وَ تَأْتي بِصُورَةِ الْباقِي مَجْزُوماً فَتَقُولُ فِي أَمْرِ الْمُخاطَبِ مِنْ تُدَحْرِجُ دَحْرِجْ

---

«وَ أَمّا الْأَمْرُ بِالصّيغَةِ فَهُوَ أَمْرُ الْحاضِرِ» یانی ئەما ئەمر کردن بە فعل بە هۆی نەفسی صیغەی فعلەوە نەک بە هۆی لام ئەوە ئەمرێکە ڕو بکاتە شخصی مخاطب. «وَ هُوَ جارٍ على لَفْظِ الْمُضارِعِ الْمَجْزُومِ فِي حَذْفِ الْحَرَكاتِ وَ النُّونِ».وە ئەو ئەمری بە صیغە ئەکەوێتە شوێنی فعلی مضارعی مجزوم وە لەسەر یاسای ئەو ئەبێ لە حەذفی حەرەکاتی ئاخری مفردە سالمەکانا ئیلاً مفردی مؤنثی مخاطب، وە لامالفعلی مفردە معتلەکان، وە لە حەذفی نونی مفرەدی مؤنثی مخاطب وە تثنیە و جەمعەکان ئیللا نونی جەمعی مؤنثی غائب وە جەمعی مؤنثی مخاطب.

«فَإِنْ كانَ ما بَعْدَ حَرْفِ الْمُضارِعِ مِنْهُ مُتَحَرِّكاً» جا ئەگەر مابعدی حەرفە مضارعەکە متحرک بوو. «فَتُسْقِطُ مِنْهُ حَرْفَ الْمُضارِعَةِ» ئەو یاسا ئەمەیە کە حەرفە مضارعەکە لابیەی لە ئەوەڵی فعلەکە «وَ تَأْتي بِصُورَةِ الْباقِي مَجْزُوماً» وە تلفظ بە سورەتی باقیماندەی فعلە مضارعەکە بە مەجزومی بە حەذفی حەرەکە یا لامالفعل یا نونی تثنیە و جەمع یا بەبێ

## دَحْرِجْ دَحْرِجَا دَحْرِجُوا دَحْرِجِي دَحْرِجَا

حەذف وەكوو لە جەمعە مؤنثەكانا «فَتَقُولُ فِي أَمْرِ الْمُخَاطَبِ مِنْ تُدَحْرِجُ دَحْرِجْ» جا تۆ ئەڵێیت لە دروستکردنی ئەمری بە صیغە لە رباعی مجردا وەکوو تُدَحْرِجُ.

«دَحْرِجْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەمرە لە تُدَحْرِجُ (ت) تێ حەرف مضارع بوو، حەذفمان کرد مابعدەکەی متحرک بوو، ابتداامان پێ کرد ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی حەرەکە گەڕا بە دَحْرِجْ.

«دَحْرِجَا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەمرە لە تُدَحْرِجَانِ (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدی حەرفی مضارع متحرک بوو ابتداامان پێکرد ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە دَحْرِجَا.

«دَحْرِجُوا» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەمرە لە تدحرجون، (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نونەکە گەڕا بە دَحْرِجُوا.

«دَحْرِجِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب ئەمرە لە تُدَحْرِجِينَ، (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە دَحْرِجِي.

«دَحْرِجَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب ئەمرە لە تُدَحْرِجَانِ (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدەکەی متحرک بوو ابتداامان پێ کرد ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە دَحْرِجَا.

دَحْرِجْنَ وَ هٰكَذٰا فَرِّحْ وَ قٰاتِلْ وَ تَكَسَّرْ وَ تَبٰاعَدْ وَ تَدَحْرَجْ وَ إِنْ كٰانَ مٰا بَعْدَ حَرْفِ الْمُضٰارِعَةِ سٰاكِناً فَتَحْذِفُ مِنْهُ حَرْفَ الْـمُضٰارِعَةِ وَ تَـأْتِي بِصُورَةِ الْبٰاقِي مَجْزُوماً مَزِيداً فِي أَوَّلِهِ هَمْزَةَ وَصْلٍ مَكسُـورَةً إِلاّٰ أَنْ يَكُونَ عَيْنُ فِعْلِ الْمُضٰارِعِ مِنْهُ مَضْمُوماً فَتَضُمُّهٰا

---

«دَحْرِجْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تُـدَحْرِجْنَ بـوو، (ت) تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کـرد، مـابعدەکـەی مـتحرک بـوو ابتدامان پیٚکرد ئاخرەکەمان مجزوم نەکرد بە حەذفی نون لەبەر ئەوە نون ضمیری فاعل جەمعە وە حەذف ناکریٚ گەڕا بە دَحْرِجْنَ.

«وَ هٰكَذٰا فَرِّحْ وَ قٰاتِلْ وَ تَكَسَّرْ وَ تَبٰاعَدْ وَ تَدَحْرَجْ» هـەر وەکـوو دَحْـــرِجْ وەهــایە لە دروستکــردنا هــەر ئـەمریٚ کـە مـابعدی حـەرفی مضارعەکەی متحرک بیٚ وەکوو ئەمری بابی تفعلیل وە مفاعلە وە تفعُّل.

«وَ إِنْ كٰانَ مٰا بَعْدَ حَرْفِ الْمُضٰارِعَةِ سٰاكِناً» عەطفە لەسەر قـەولی مصنف کە فەرموی: فَإِنْ كٰانَ مٰا بَعْدَ حَرفَ الْمُضٰارَعة مُـتحرِكاً. یـانیٚ ئەگەر مابعدی حەرفی مضارعەکە ساکـن بـوو «فَـتَحْذِفُ مِـنْهُ حَـرْفَ الْمُضٰارِعَةِ وَ تَأْتِي بِصُورَةِ الْبٰاقِي مَجْزُوماً» ئەوە تـۆ حـەزفی حـەرفی مضارعەکەی لیٚ ئەکەی وە تلفظ ئەکەی بە صورەتی ئەوە کە ماوەتەوە لە مضارعە کە بە مجزومی بەو یاسایەی کەوتمان «مَزِيداً فِي أَوَّلِـهِ هَـمْزَةَ وَصْلٍ مَكسُورَةً» لە حالیٚکدا زیاد بکریٚ لە ئەوەڵی ئەو فعلە مضارعە وە هەمزەی وەصلی مکسورە لەبەر دەفعی ابتدا بە ساکن. «إِلاّٰ أَنْ يَكُونَ عَيْنُ

فَتَقُولُ اُنْصُرْ اُنْصُرا اُنْصُرُوا اُنْصُرِي

فِعْلِ الْمُضارِعِ مِنْهُ مَضْمُوماً» مەگەر کاتێ کە عین‌الفعلی ئەو مضارعە مضموم بێ وەکو: تَنْصُرُ وە تَحْسُنُ «فَتَضُمُّها» ئەوە لەو کاتەدا ئەو هەمزە وەصلە مضموم ئەکەی لەبەر مناسبەی ضمەی عین‌الفعلەکەی «فَتَقُولُ اُنْصُرْ» جا تۆ ئەڵێیت لەکاتی دروستکردنی ئەمری بە صیغە لە مضارعی بابی ئەوەڵ لە ثلاثی مجرّد اُنْصُرْ ئەمرە لە تَنْصُرُ (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیەوە بە هەمزەی وەصلی مضمومە لەبەر مناسبەی ضمەی عین‌الفعلەکەی وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی حەرەکە گەڕا بە اُنْصُرْ.

«اُنْصُرا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب ئەمرە لە تَنْصُرانِ (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیەوە بە هەمزەی وەصلی مضمومە، وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اُنْصُرا.

«اُنْصُرُوا» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرُونَ بوو، (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد وە هاتین لە ئەوەڵیەوە بە هەمزەی وەصلی مضمومە، وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اُنْصُرُوا.

«اُنْصُرِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب ئەمرە لە تَنْصُرِینَ، (ت) تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیەوە بە هەمزەی وەصلی مضمومە، وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اُنْصُرِي.

## أُنْصُرَا أُنْصُرْنَ وَ كَذٰلِکَ اِضْرِبْ وَ اِعْلَمْ وَ اِنْقَطِعْ وَ اِجْتَمِعْ وَ اِسْتَخْرِجْ

«أُنْصُرَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەمرە لە تَنْصُرَانِ، (ت) تـێ کـە حەرفی مضارع بوو حەذفمان کـرد، وە هـاتین لە ئـەوەڵیەوە بـە هـەمزەی وەصڵی مضمومە، وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حـەذفی نـون گـەڕا بـە أُنْصُرَا.

«أُنْصُرْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَنْصُرْنَ بوو، (ت) تێ کە حـەرفی مـضارع بـوو حـەذفمان کـرد، وە هـاتین لە ئـەوەڵیەوە بـە هەمزەی وەصڵی مضمومە، وە ئاخرەکەمان مجزوم نەکرد بە حەذفی نون چۆنکە ضمیری فاعلی جەمعی مؤنثە وە حەذف ناکرێ گەڕا بە أُنْصُرْنَ.

«وَ کَذٰلِکَ اِضْرِبْ وَ اِعْلَمْ وَ اِنْقَطِعْ وَ اِجْـتَمِعْ وَ اِسْـتَخْرِجْ» یـانی وەکوو دروستکردنی صیغەی ئـەمری مـخاطبە لە أُنْـصُرْ کـە مـابعدی حەرفی مضارعەکـەی تـێدا سـاکـنە. دروستکـردنی ئـەمر لەهـەر فـعلە مضارعێ کە مابعدی حەرفە مضارعە لە وا ساکن بێ وەکوو اِضْرِبْ وەهاو وێنەکانی.

جا لەبەر ئەوە لەم شوێنا پرسیار کرا لە مصنّف کە تۆ بڕیارتدا کە: هەر فعلێ مابعدی حەرفی مضارعەکەی تێدا ساکن بێ، ئەوە لە پاش حەذفی حەرفە مضارعەکە دییت لە ئەوەڵیەوە بە هەمزەی وەصڵی مکسورە، ئیللا لەو فعلانا کە عینالفعلەکەی مضموم بوو بێ وەکوو تَنْصُرُ مع انـە تـۆ بـە خەلافی ئەو بڕیاری خۆتە هەمزەی ئەمری تکرم وە وێـنەکـانیت مـفتوح

وَ فَتَحُوا هَمْزَةَ أَكْرِمْ بِنٰاءً عَلَى الأَصْلِ الْمَرْفُوضِ فَإِنَّ أَصْلَ تُكْرِمُ تُأَكْرِمُ
وَ اعْلَمْ انَّهُ اِذٰا اجْتَمَعَ تٰاءٰ انِ في أَوَّلِ مُضٰارِعِ تَفَعَّلَ وَ تَفٰاعَلَ وَ تَفَعْلَلَ

---

کردوە، مصنف ؒ ـ جوابی ئەو پرسیارەی داوە، وە فەرمووی: «وَ فَتَحُوا هَمْزَةَ أَكْرِمْ بِنٰاءً عَلَى الأَصْلِ الْمَرْفُوضِ» عەرەب هەمزەی أمری تُكرِمُ یان مفتوح کرد وە، لەبەر بناو دروستکردنی لە فعلە مضارعە ئەصڵەکە ئەوەی لە ئیستعمال‌دا تەرک کراوە، وە حەرفی مضارعەکەیان حەذف کرد وە، جا لەبەر ئەوە مابعدی حەرفە مضارعەکە متحرک بووە ابتدایان پێ کرد وە «فَإِنَّ أَصْلَ تُكْرِمُ تُأَكْرِمُ» بە ڕاستی ئەصڵی تُكْرِمُ بێ همزە تُأَكْرِمُ بو لەگەڵ هەمزەی قطعی مفتوحەدا، وە لەپاش حەذفی حەرفە مضارعەکە چونکی مابعدەکەی متحرک بوو ابتدایان پێ کردوە، وە ئاخرەکەیان مجزوم کرد وە بە حەذفی حەرەکەی تا گەڕا بە أَكْرِمْ بە هەمزەی قطعی مفتوحە.

بناءً علیه دروستکردنی أَكْرِمْ بەر قاعدەی ئەوەڵ ئەکەوێ کە شامل بوو بۆ ئەمری دَحْرِجْ وَ فَرِّحْ وَ قٰاتِلْ وە بەر قاعدەی دوهەم ناکەوێ کە شاملە بۆ وێنەی اِضْرِبْ وَ اِعْلَمْ وە غەیری ئەوانیش.

جا لە کاتێک‌دا مصنّف لێ بویە وە لەباسی بنای ئەمری بە صیغە لە فعلی مضارع دەستی کرد بە باسی تخفیفی ئەو فعلە مضارعانە کە دو حەرفی (ت) تێ لە ئەوەڵیانەوە گرد ئەبنەوە.

مصنف فەرموی: «وَ اعْلَمْ انَّهُ اِذٰا اجْتَمَعَ تٰاءٰانِ فی أَوَّلِ مُضٰارِعِ تَفَعَّلَ وَ تَفٰاعَلَ وَ تَفَعْلَلَ» تۆ بزانەلە کاتێک دا دوو (ت) تێ گردبوو نەوە لە

**فَيَجُوزُ إِثْبَاتُهَا نحو تَتَجَنَّتُ وَ تَتَقَاتَلُ و تَتَدَحْرَجُ وَ يَجُوزُ حَذْفُ إِحديْهُمَا تَخفِيفاً نحو فَأَنْتَ لَهُ تَصَدّىٰ وَ نَاراً تَلَّظىٰ و تَنزَلُ الْمَلٰئِكَةُ**

ئەوەڵی مضارعی ئەم سێ بابانەدا، وەکو(شەش صیغەی مخاطب) وە (دو صیغەی مفردی مؤنث) وە (تثنیەی مؤنثی غائب).«**فَيَجُوزُ إِثْبَاتُهَا نحو تَتَجَنَّتُ وَ تَتَقَاتَلُ و تَتَدَحْرَجُ**»ئەوە دروستە هێشتنەوی هەردو(ت) تێ یەکەی وەکو ئیستە و تمان «**وَ يَجُوزُ حَذْفُ إِحديْهُمَا تَخفِيفاً**» وە دروستە حذفی یەکێ لەو دو (ت) تێ یە بۆسوک کردنی ئەوکلمە لەسەر زمان «**نحو فَأَنْتَ لَهُ تَصَدّىٰ**» ئەصڵەکەی تَتَصَدّىٰ بوو حذفی یەکێ لەو دوو (ت) تێمانە کرد بۆ تخفیف گەڕا بە تَصَدّىٰ «**وَ نَاراً تَلَّظىٰ**» ئەصڵەکەی تَتَلَظّىٰ بوو یەکێ لە (ت) تێکانمان حذف کرد گەڕا بە تَلَظّىٰ و «**و تَنزَلُ الْمَلٰئِكَةُ**» ئەصلەکەی تَتَنَزَّلُ بوو، حذفی یەکی لە (ت) تێکانمان کرد گەڕا تَنَزَّلُ.

جائەگەر یەکێ پرسیاری کرد دەلیلت چییە بۆئەوە ئەم صیّغانە مضارعن وە حذفی یەکێ لە(ت) تێ کانیان کراوە وە فعلی ماضی نین بە یەک (ت) تێ لەسەر یاسای خویان؟

لە جوابیاندا بڵێ:ـ دەلیلم ئەمەیە ئەگەر ئەمانە فعلی ماضی بونایە ئەخوێنرانە وە (تَصَدَّيْتَ) بۆ مفردی مذکری مخاطب لە ماضیدا بە قرینەی ضمیری أَنتَ.وَ تَلَظَّتْ بۆ مفردی مؤنثی غائب بە (ت) تێ ی تأنیثی ساکنە وە بە قرینەی لفظی نَاراً لە پێشە وەکە مؤنثە.و تَنَزَّلَتْ بۆ مفردی مؤنثی غائب لە ماضیدا بە (ت) تێ ی تأنیثی ساکنە وە یا خود لەبەر رعایەتی تأنیثی لفظی ملائکە لە دوایەوەکە مؤنثی لفظیە

وَ اعْلَمْ اَنَّهُ مَتىٰ كٰانَ فٰاءُ اِفْتَعَلَ صٰاداً أَو ضٰاداً أَو طاءً او ظٰاءاً قُلِبَتْ تٰائُهُ طٰاءاً فَتَقُولُ فِي بِنٰاءِ اِفْتَعَلَ مِنَ الصُّلْحِ اِصْطَلَحَ وَ مِنَ الضَّرْبِ اِضْطَرَبَ

---

یا خود تنزل به فتحەی لام‌الفعل له سەر عدم رعایەتی تأنیثه لفظی یه کەی.

جاپاش ڕزگار بوون له باسی حوكمی گردبونه وەی (ت) تیٚ لەو بابانەدا.دەستی كرد به باسی بازیٚ قاعده و دەستور بوٚبابی اِفْتِعٰال و فەرموی:«وَ اعْلَمْ اَنَّهُ مَتىٰ كٰانَ فٰاءُ اِفْتَعَلَ صٰاداً أَو ضٰاداً أَو طاءً او ظٰاءاً»بزانه كاتیٚ كه فاءالفعلی بابی افتعال یه كیٚ بوو لەو چوار حرفانه «قُلِبَتْ تٰائُهُ طٰاءاً» ئەوه قەلبی ئەو (ت) تیٚ بچوكه زائده ئەكریٚ به جنسی فاء الفعله كەی «فَتَقُولُ فِي بِنٰاءِ اِفْتَعَلَ مِنَ الصُّلْحِ اِصْطَلَحَ» بوٚ مفردی مذكری غائب له ماضی بابی افتعال دا، ئه صڵه كەی اِصْتَلَحَ بوو جاقەلبی (ت) تیٚ زائده كەمان كرد به طی گەوره گەڕا به اِصْطَلَحَ.هەر وەها دروسته قەلبی ئەو طیٚ گەروره بكەی به صاد وه صادْ دەغم بكەی له صادا و بڵێی اِصَّلَحَ، بەڵام دروست نیه عەكسه كەی، چونكی صادله حروفی (صفیره) واته خاوەن ئاوازەی تیژه، وه قەلب ناكریٚن به غیری خوٚیان.

«وَ مِنَ الضَّرْبِ اِضْطَرَبَ» وه ئەڵێیت له دروست كردنی بابی افتعال له مادەی ضَرْب اِضْطَرَبَ ئەصڵه كەی اِضْتَرَبَ، قەلبی (ت) تیٚی زائدەی بچوكمان كرد به طی گەوره گەڕا به اِضْطَرَبَ، هەروا دروسته ئەوطیٚ گەوره بكەی به ضاد وه ضادله ضادا دەغم بكەی وه بڵێیت اِضَّرَبَ، بەڵام عەكسه كەی دروست نیه چونكه حەوت حەرفەی (ضوی مشفر) دغم ناكرین له

وَ مِنَ الطَّرْدِ اِطَّرَدْ وَ مِنَ الظُّلمِ اِظْطَلَمَ وَ كَذٰلِکَ جَمیعُ مُتَصَرِّفٰاتِهِ «نحو يَصْطَلِحُ و هو مُصْطَلِحٌ وَ ذٰالِکَ مُصْطَلَحٌ وَ اِصْطَلِحْ وَ لاٰ تَصْطَلِحْ

---

خۆیانا بازێکیان كه بازیکیان دەی له غەیری خۆیانا به طریق الاولی، دغم ناکرێن «وَ مِنَ الطَّرْدِ اِطَّرَدْ» به تشدیدی طێ ئەصڵه کەی اِطْتَرَدَ بوو به طێ ی گەورەی ئەصڵی وه تێ ی بچوکی زائده قەلبی تێ زائده کەمان کرد به وێنەی فاءالفعله کەی ئەوەڵمان له دوهه مدادەغم کرد گەڕا به اِطَّرَدَ «وَ مِنَ الظُّلمِ اِظْطَلَمَ» تۆ ئەڵێیت له دروست کردنی ماضی بابی افتعال له ظلم اِظْطَلَمَ ئەصڵه کەی اِظْتَلَمَ بوقەلبی (ت) تێ زائده کەمان کرد به طێ گەوره گەڕا به اِظْطَلَمَ وه دروسته قەلبی ظێ ی نوختەدار بکەی به طێ ی بێ نوخته له سەر قیاس وه دغمی طێ بکەی له طێ داوه بڵێیت:اِطَّلم.وه دروسته قەلبی طێ ی بێ نوخته بکەی به ظێ ی نوختەدار له سەر خلافی قیاس وه ظێ دەغم بکەی له ظێ دا، وه بڵێیت اِظَّلَمَ.«وَ كَذٰلِکَ جَمیعُ مُتَصَرِّفٰاتِهِ» هەروا به حوکمی تطبیقی قاعدەی ڕابردو که قەلبی (ت) تێ یه لەهەموو مشتقاتی یەکه یەکەی ئەو چوار مادەداکەڕابوران «نحو يَصْطَلِحُ» که فعلی مضارعه«و هو مُصْطَلِحٌ» که اسمی فاعله «وَ ذٰالِکَ مُصْطَلَحٌ» که اسمی مفعوله «وَ اِصْطَلِحْ» که ئەمر به صیغەیه «وَ لاٰ تَصْطَلِحْ» هەروایه حوکمی مشتقاتی باقی مادەکان، وه له هەمویانا قەلبی (ت) تێ ی زائده ئەکرێ به

وَ اعْلَمْ أَنَّهُ مَتىٰ كَانَ فٰاءُ اِفْتَعَلَ دٰالاً أَوْ ذٰالاً أَوْ زٰاءً قُلِبَتْ تٰائُهُ دٰالاً فتقول فِي اِفْتَعَلَ مِنَ الدَّرْءِ وَ مِنَ الذِّكْرِ وَ مِنَ الزَّجْرِ اِدَّرَأَ اِذَّكَرَ اِزَّجَرَ

---

وێنەی فاءالفعلە کەی «وَ اعْلَمْ أَنَّهُ مَتىٰ كَانَ فٰاءُ اِفْتَعَلَ دٰالاً أَوْ ذٰالاً أَوْ زٰاءً قُلِبَتْ تٰائُهُ دٰالاً» تۆ بزانە کاتێ کە فاءالفعلی بابی افتعال دال بێ یا ذال بێ یازێ ئەوە قەلبی تێ زائدە کەی ئەکرێ بـە دال «فتقول فِي اِفْـتَعَلَ مِـنَ الدَّرْءِ وَ مِنَ الذِّكْرِ وَ مِنَ الزَّجْرِ» جائۆ ئەڵێیت لە دروست کردنی ماضی بابی افتعال لە حروفی درء «اِدَّرَأَ» ئەصڵە کەی اِدْتَرَءَ بوو قەلبی تێ زائدە کەمان کرد بە دال وە دالمان دەغم کرد لە دالا گەڕا بە ادّرأ... وە لە حروفی ذکر «اِذَّكَرَ» ئەصڵە کەی اِذْتَكَرَ بوو قەلبی تێ زائدە کەمان کرد بە دال گەڕا بە اِذْدَكَرَ جال قەلبی دالمان کرد بە ذال بە خلافی قیاس وە ذالمان لە ذالا دەغم کرد گەڕا بە اِذَّكَرَ، وە دروستە قەلبی ذال بکەی بە دالی بێنوختە وە دەغمی دال بکەی لە دالا بڵێی اِدَّكَر.وە لە حروفی زجر «اِزَّجَرَ» ئەصڵە کەی اِزْتَجَرَ بوو قەلبی تێ زائدە کەمان کرد بە زێ وە زێمان لە زێدا دەغم کرد گەڕا بە اِزَّجَرَ.

# بَیانُ نُونِ التَّأکِیدِ الْخَفِیفَةِ وَ الثَّقِیلَةِ

بَیانُ نُونِ التَّأکِیدِ الْخَفِیفَةِ وَ الثَّقِیلَةِ وَ تَلْحَقُ الْفِعْلَ غَیْرَ الْماضِی و الْحالِ نُونانِ لِلتَّأکِیدِ اِحْدیٰهُما خَفِیفَةٌ ساکِنَةٌ وَالْاُخْریٰ ثَقِیلَةٌ مَفْتُوحَةٌ اِلاّ فِیما تَخْتَصُّ بِهِ وَ هُوَ فِعْلُ الْاِثْنَیْنِ وَ جَماعَةُ النِّساءِ فَهِیَ مَسْکُورَةٌ فِیهِما

---

جا کاتێ مصنّف ڕزگاری بوو لە باسی قاعدە کانی بابی افتعال دەستی کرد بە باسی ئیلحاقی نونی ثقیلە و خفیفە بە ئاخری فعلەوە وە فەرموی:«وَ تَلْحَقُ الْفِعْلَ غَیْرَ الْماضِی و الْحالِ نُونانِ لِلتَّأکِیدِ» یانی لاحق ئەبێ‌و ئەلکێ بە ئاخری فعلە وە دو نون بۆ تأکید وە هێزدان بە مەعنای فعلەکە ئیلا فعلی ماضی وە فعلی مضارع کە بە کاربێت بۆ زەمانی حاڵ چونکی فعلی ماضی ڕابوردوەو لە دەست دەر چوە، وە تأکیدی بێ‌سودە، و فعلێکیش کە فاعلە کەی مشغول بێ‌پییە وە تأکید لەسەر کردنە کەی وەکو تحصیلی حاصل وایە «اِحْدیٰهُما خَفِیفَةٌ ساکِنَةٌ» یەکێ لەو نونانە سوکەو زەنەدارە«وَالْاُخْریٰ ثَقِیلَةٌ مَفْتُوحَةٌ» ئەوی کەیان گرانە و گیراو وەسەرەی هەیە «اِلاّ فِیما تَخْتَصُّ بِهِ وَ هُوَ فِعْلُ الْاِثْنَیْنِ وَ جَماعَةُ النِّساءِ فَهِیَ مَسْکُورَةٌ فِیهِما» یانی ئەو نونە ثقیلە بە دەوام مفتوحە ئیللالە فعلێک داکە تەنیا نونی ثقیلەی پێوە بلکی وەنونی خفیفەی بۆ نەبێ کە ئەویش فعلی تثنیەی مذکر و مؤنث وەفعلی جمعی مؤنثی مطلقاً ئەوە، ئەو نونە ثقیلە

**فَتَقُولُ اِذْهَبَانٍّ اِذْهَبْنَانٍّ فَتُدْخِلُ اَلِفاً بَعْدَ نُونِ الْجَمْعِ لِتَفْصُلَ بَيْنَ النُّونَاتِ وَ لَا تَدْخُلُهُمَا الْخَفِيفَةُ لِأَنَّهُ يَلْزَمُ اِلْتِقَاءُ السَّاكِنَيْنِ عَلَى غَيْرِ حَدِّهِ**

---

مكسوره لەواندا لەبەر مشابهەی بە نونی تثنیە وە لەوا کە واقع بوە لەپاش ئەلفە وە، ئەمما لە تثنیەدا ئەوە دیارە کە نونە کەی والە پاش ئـەلفە وە، وە ئەمما لە فعلی جمعی مؤنثدا ئەوە لەبەر ئەوەیە کاتێ کە نونی ثقیلەی پێوە لاحق بوو ئەلفێ زیاد ئەکرێ لە بەینی نونی جمع وە نونی تأکیدە کە دابێ ئەوە ببێ بە فاصلە لە بەینی نونی جمع وە نونە تأکیدە کەدا«**فَتَقُولُ**» جاتۆ ئەڵێیت بۆ مثالی کسرەی نونی تأکید لە تثنیەدا«**اِذْهَبَانٍّ**» بۆ تثنیەی مذکری مخـاطب ئەصڵەکەی اِذْهَبَا بوو جا نونی تأکیدی ثـقیلەمان ئیلحاق کـرد پێیەوە مکسوریشمان کرد لەبەر هاو وێنەیی لەگەڵ نونی تثنیەدا گـەڕا بـە اِذْهَبَانٍّ.

وە ئەڵێیت بـۆ مـثالی کسـرەی نـونی تأکـیدی ثـقیله لە جـمعی مـؤنثا «**اِذْهَبْنَانٍّ**» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب ئەصڵەکەی اِذْهَبْنَ بو نونی تأکیدی ثقیلەمان ئیلحاق کرد پێیەوە گەڕا بە اِذْهَبْنَن جا هاتین بە ئەلفێ لە پێش نونە تأکیدە کەدا وە مکسوریشمان کرد لەبەر هاو وێنەیی بۆ نونی تثنیە گەڕا بە اِذْهَبْنَانٍّ.«**فَتُدْخِلُ اَلِفاً بَعْدَ نُونِ الْجَمْعِ لِتَفْصُلَ بَيْنَ النُّونَاتِ**» جائۆ ئەلفێ داخڵ ئەکەی لەو صیغەدا لەپاش نونی جمعی مؤنث وەلە پێش نونی تأکیدە کەدا بۆئەوە جیایی بخاتە بەینی نونی جمع نونی تأکیدا.

«**وَ لَا تَدْخُلُهُمَا الْخَفِيفَةُ**» ئێتر نونی خفیفە داخڵی فعلی تثنیە و فعلی جمعی مؤنث نابێ.«**لِأَنَّهُ يَلْزَمُ اِلْتِقَاءُ السَّاكِنَيْنِ عَلَى غَيْرِ حَدِّهِ**» لە بەر ئەوە

**فَإِنَّ اِلْتِقٰاءَ السّٰاكِنَيْنِ اِنَّمٰا يَجُوزُ اِذٰا كٰانَ الْأَوّلُ حَرْفَ مَدٍّ وَالثّٰانِی مُدَّغَماً نحو دٰابَّةٍ**

کە ئەگەر نونی خفیفە یان پێوە لاحق ببێ لازم دێ خارج بونی لە یاسا وەکو بە یەک گەشتنی دو حەرفە ساکن لە غیری ئەو شوین و جێگایە کە بۆیان بڕیار دراوە «**فَإِنَّ اِلْتِقٰاءَ السّٰاكِنَيْنِ اِنَّمٰا يَجُوزُ اِذٰا كٰانَ الأَوّلُ حَرْفَ مَدٍّ وَالثّٰانِی مُدَّ غَماً**» بە ڕاستی پێک گەشتنی دو حەرفی ساکن ڕەوانە دراوە مەگەر بە مەرجێ:

ئەوەڵ حەرف لە و ساکنانە حەرفی مدّ بێ کە واوی ساکنی ماقبل مضموم وە یێ ی ساکنی ماقبل مکسور وە ئەلفی ماقبل مفتوح.وە دوهەم حەرفیان دەغم کرابێ لە وێنەی خۆیا «نحو دٰابَّةٍ» ئەصڵەکەی دٰابِبَةٌ بوو وەکو ضٰارِبَةٌ اجتماعی مثلین ڕوی دا ئەوەڵمان دەغم کرد لە دوهە مدا،گەڕا بە دابةٌ وەلێرە دو ساکن بە یەک گەشتن، بەڵام ڕەوایە چونکە ئەوەڵ ساکن ئەلفە وە دوەمیان بێ کەیە کە دەغم کراوە لە بێ ی دوهە مدا.

*جابزانن مصنف حەصری جوازی التقاء الساکنینی کرد لەم شوێنەدا چونکە لەبەر زوری ئیستعمالی ئەم شوێنەیە، ئەناله دو شوێنی تریشا ڕەوا دراوە:

١ـ داخڵ بوونی همزەی ئیستفهامە لەسەر مُعرَّف بە الف لام بە مەرجی قەلبی همزەی تعریفە کە بە ئەلف وەکو ءٰالحسن ئیستە لامی تعریفە کە ساکنە وە همزەکەیشی کراوە بە ئەلف ساکنە و بە یەک گەشتون، ئەم وێنەیە ڕەوا دراوە..

وَ يُحْذَفُ مَعَهُمَا النُّونُ الَّتِي فِي الْأَمْثِلَةِ الْـخَمْسَةِ وَ هِـيَ يَـفْعَلَانِ وَ تَفْعَلَانِ و يَفْعَلُونَ وَ تَفْعَلِينَ وَ يُحْذَفُ وٰاوُ يَفْعَلُونَ وَ تَـفْعَلُونَ وَ يٰـاءُ تَفْعَلِينَ

---

٢ـكاتی ڕاوه ستانه لەسەر لفظێ كه ماقبلی ئاخرەكـەی سـاكـن بـێ وەكو:زَيْدْ ـبَكْرْ ـعَمْرْ و ئیسته حەرفی ئاخریان ساكنه به وەقفی لەسەری، وه ماقبلی ئەویش له ذاتی خۆیا ساكن وه ڕەوایش دراوه.

وَ يُحْذَفُ مَعَهُمَا النُّونُ الَّتِي فِي الْأَمْثِلَةِ الْخَمْسَةِ وَ هِيَ يَفْعَلَانِ وَ تَفْعَلَانِ و يَفْعَلُونَ وَ تَفْعَلِينَ يەكەم: بۆ تثنیەی مـذكر غـائب.دوهـەم: بـۆ تثنیەی مؤنثی غائب وه مذكری مخاطب و مؤنثی مخاطب. سێهەم: بـۆ جمعی مذكری غائب.چـوارەم:بـۆ جـمعی مـذكری مـخاطب.پـێنجەم:بـو مفردی مؤنثی مخاطب.

جاواته حەذف ئەكرێن لەگەڵ ئیلحاقی نونی تأكیدا به ئەفعالی خمسەوه ئەو نونه كه زو لەگەڵ ئەوانا بووه چونكی حەرفی ئیعرابه، وه نونی تأكید به هەر فعلێكەوه لكان ئەیكەن به مبنی.«وَ يُحْذَفُ وٰاوُ يَفْعَلُونَ وَ تَفْعَلُونَ وَ يٰاءُ تَفْعَلِينَ» وەهەم حەذف ئەكرێ لەكاتی لحوقی نونی تأكید به فعله وه، واوی ضمیری فاعل له جمعی مذكری غائب وه مـخاطب، وه(ی) یـێ ی ضمیری فاعل له مفرەدی مؤنثی مخاطبا لەبەر ئەوه التقاء الساكنین پەیدا ئەبێ له بەینی ئەو واو و (ی) یێ دا لەگەڵ نونه تأكیده كەدا. وه اكتفا ئەكرێ به ضمەی ماقبلی واو له واوەكە، وه به كسرەی ماقبلی ئەو(ی) یێ ی ضمیر له (ی) كه.

## اِلاَّ اِذَا انْفَتَحَ مَاقَبْلَهُمَا نحو لاٰ تَخْشَوُنَّ وَ لاٰ تَخْشَيِنَّ

«اِلاَّ اِذَا انْفَتَحَ مَاقَبْلَهُمَا» مەگەر کاتێ کە حەرفی ماقبلی ئەو واو و یێیە مفتوح بێ ئەوەلە و کاتا ئەو واو یێیە حەذف ناکرێن چونکی ضمە نیەلە پێش واوەکەوە، وە کسرە نیە لە پێش (ی) یێ کە وە هەتا دەلاّلەت بکەن لەسەریان، و ضمیری فاعلیش عُمدەیە، بەبێ دەلیل حەذف ناکرێ، وەلەم کاتا واوەکە مضموم ئەکرێ، وەیێ کە مکسور ئەکرێ.«نحو لاٰ تَخْشَوُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَخْشَيُونَ بوو، وەکو تَعْلَمُونَ.یێ متحرک ماقبل مفتوح قبلمان کرد ئەلف، وە خەذفیشمان کرد لەبەر التقاء الساکنین لە بەینی ئەلف و واوەکەدا گەڕا بە تَخْشَوْنَ، لای ناهیەمان داخل کردە سەری، وە فعلەکەی مجزوم کرد بە حذفی نون گەڕا بە لاتَخْشَوْ جامۆکّدمان کرد بە نونی ثقیلە وە التقاء الساکنین پەیدا بوو لە بەینی واو و نونەکەدا دروست نەبو و حەذفی نونەکە بکەین لەبەر ملاحظەی تأکیدەکە، وە دروستیش نەبوو کە حذفی واوەکە بکەین چونکی ضمیری فاعل عمدەیە وە بەبێ دەلیل حەذفی ناکرێ، وە ماقبلەکەیشی مفتوح بوو وە مضموم نەبو هەتا دەلاّلەت بکالە سەری، ناچار بوین واوەکەمان مضموم کرد بۆ دەفعی التقاء الساکنین لەبەر ئەوەکە واو مناسبی ضمەیە گەڕا بە لاٰتَخْشَوُنَّ، لەسەر وەزنی لاٰتَفْعَوُنَّ بە حەذفی لام‌الفعل لەبەر حەذفی یێی لام‌الفعل لە موزونەکەدا.

«وَ لاٰ تَخْشَيِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَخْشَيِينَ بوو وەکو تَعْلَمِينَ، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، وە ئەلفە

# وَ لَتُبْلَوُنَّ

کەمان حذف کرد لەبەر التقاء الساکنین گەڕا بە تَخْشَیْنَ لای ناهیەمان داخل کردە سەری، حەذفی نونەکەی کرد گەڕا بە لاتَخْشَیْ مؤکدمان کرد بە نونی ثقیله وه، جا التقاء الساکنن پەیدا بوو لەینی یێ و نونە تأکیدە کەدا، حەذفی نونەکەمان نەکرد لەبەر ملاحظەی تأکیدەکە، وە حەذفی یێ کەشمان نکرد چونکی ماقبلەکەی مفتوح بوو، وە شتێ نبوو کە دەلیل بێ لەسەر یێ کە، وە ضمیری فاعلیش عمدەیە بەبێ دەلیل حەذف ناکرێ، ناچار حەرەکە دارمان کرد بە کسرە لەبەر مناسبەی یێ لەگەل کسرەدا گەڕا بە لاتَـخْشَیِنَّ لەسەر وەزنی لاتَفْعَیِنَّ بە حەذفی لام‌الفعل لە موزونەکە یا وەکو باسمان کرد.

«وَ لَتُبْلَوُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب بنا مفعول، ئەصڵەکەی تُبْلَوُونَ بوو وەکو تُنْصَرُونَ، واو متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، وە ئەلفەکمان حذف کرد لەبەر التقاء الساکنین لە بەینی خۆیو واوەکەدا گەڕا بە تُبْلَوْنَ، جا لامی جوابی قەسەم هاتە سەری، وە مؤکدمان کرد بە نونی ثقلیه، و حذفی نونی جمعمان کرد، جا التقاء الساکنین دروست بوو، لەبەینی واو و نونە تأکیدەکەدا، دروست نەبوو حذفی نونەکە بکەین، لەبەر ملاحظەی تأکیدی فعلەکەی، وە دروستیش نەبوو حذفی واوەکە بکەین چونکە ماقبلەکەی مفتوح بوو، وە حرەکەی نەبوو دەلالەت بکات لەسەری ناچار نفسی واوەکمان مضموم کرد لەبەر مناسبەی واو لەگەڵ ضمە گەڕا بە لَتُبْلَوُنَّ لەسەر وەزنی لَتُفْعَوُنَّ بە حذفی لامەکەی لەبەر حذفی لام‌الفعل لە موزونەکەیدا.

وَ اِمّا تَرَیِنَّ وَ یُفْتَحُ مَعَ النُّونِ آخِرُ الْفِعْلِ اِذا کانَ لِلْواحِدِ وَالْواحِدَةِ وَ یُضَمُّ اِذا کانَ فِعْلُ جَماعَةِ الذُّکُورِ

«وَ اِمّا تَرَیِنَّ» بۆ مفرەدی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَرْأَیِینَ بوو، وەکو تَعْلَمِینَ، حذفی همزە کەمان کرد لەبەر تخفیف پاش نقڵی فتحەکەی بۆ ماقبلی، جایێ‌ی ئەوەڵ متحرک وە ماقبل مفتوح بوو قەلبمان کرد بە ئەلف، وە ئەلفەکەیشمان حذف کرد لەبەر التقاء الساکنین گەڕا بە تَرَیْنَ لەسەر وەزنی تَفَیْنَ بە حذفی عەین وەلام لەبەر حذفی عین‌الفعل وە لام‌الفعل لە موزونەکەیا، جا اِمّای شرطیەمان داخل کردە سەری وە حذفی نونەکەی کرد گەڕا بە اِمّا تَرَیْ مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلەوە وە التقاء الساکنین پەیدا بوو لە بەینی یێ و نونەکەدا دروست نەبوو حذفی نونەکە بکەین، لەبەر ملاحظەی تأکیدی فعلەکە وە دروستیش نەبوو حذفی یێ بکەین چونکە ماقبلەکە مفتوح بوو، وە دەلیل لەسەر یێ کە نەبوو، ناچار مکسورمان کرد لەبەر مناسبەی یێ لەگەڵ کسرەدا گەڕا بە اِمّا تَرَیِنَّ لەسەر وەزنی تَفَیِنَّ بە حذفی عین وە لام لەبەر ئەوەکە حذفی عین‌الفعل وە لام‌الفعل کراوە لە موزونەکەیدا.

«وَ یُفْتَحُ مَعَ النُّونِ آخِرُ الْفِعْلِ اِذا کانَ لِلْواحِدِ وَالْواحِدَةِ» یانی مفتوح ئەکرێ ئاخری فعل لە کاتی تأکید بە نونی ثقیلە یا خفیفە، هەرکاتێ ئەو فعلە لەسەر صورەتی مفردی مذکری غائب یا مخاطب یا متکلم بێ وە یا بۆ مفردی مؤنثی غائب بێ «وَ یُضَمُّ اِذا کانَ فِعْلُ جَماعَةِ الذُّکُورِ» وە ئە مێنێتە وە لەسەر ضمە هەرکاتی فعلی جماعەتی مذکر غائب یا مخاطب

وَ يُكْسَرُ اِذٰا كٰانَ فِعْلَ الْوٰاحِدَةِ الْمُخٰاطَبَةِ فَتَقُولُ فِى أَمْرِ الْغٰائِبِ مُؤَكَّداً بِالنُّونِ الثَّقِيلَةِ لِيَنْصُرَنَّ لَينصُرٰانٍّ لِيَنْصُرُنَّ لِتَنْصُرَنَّ لِتَنْصُرٰانٍّ

---

بىٚ «وَ يُكْسَرُ اِذٰا كٰانَ فِعْلَ الْوٰاحِدَةِ الْمُخٰاطَبَةِ» وه ئه هيٚلريٚته وه لەسەر كسره هەركاتىٚ فعلى مفردى مؤنثى مخاطب بىٚ «فَتَقُولُ فِى أَمْرِ الْغٰائِبِ مُؤَكَّداً بِالنُّونِ الثَّقِيلَةِ» جا تۆ ئەلٚييٚت له ئەمرى غائب دا له كاتيكدا مؤكد بىٚ به نونى ثقيله وه «لِيَنْصُرَنَّ» بۆ مفردى مذكرى غـائب، ئـەصلٚه كـەى لِيَنْصُرْ بوو مؤكدمان كرد به نونى ثقيله، وه، ئاخره كەمان مفتوح كرد گەڕا به لِيَصُرَنَّ.

«لَينْصُرٰانٍّ» بۆ تثينەى مذكرى غائب، ئەصلٚه كەى لِيَنْصُرا بوو مؤكدمان كرد به نونى ثقيله وه، وه نونه كەمان مكسور كرد گەڕا به لِيَصُرٰانٍّ.

«لِيَنْصُرُنَّ» بـۆ جـمعى مـذكرى غـائب، ئـەصلٚه كـەى لِـيَنْصُرُوا بـوو، مؤكدمان كرد به نونى ثقيله وه حذفى واوه كەمان كرد لەبەر التقاءالساكنين، وه ماقبله كەمان به مضمومى هيٚشته وه بۆ ئەوه دەلالت بكا لەسەر واوه كه گەڕا به لِيَنْصُرُنَّ.

«لِتَنْصُرَنَّ» بۆ مفردى مؤنثى غائب، ئەصلٚه كەى لِتَنْصُرْ بوو، مؤكدمان كرد به نونى ثقيله وه ئاخره كەمان مفتوح كرد گەڕا به لِتَنْصُرَنَّ.

«لِتَنْصُرٰانٍّ» بۆ تثنيەى مؤنثى غائب، ئەصلٚه كەى لِتَنْصُرا بوو مؤكدمان كرد به نونى ثقيله وه نونه كەمان مكسور كرد گەڕا به لِتَنْصُرٰانٍّ.

**لِيَنْصُرْنَانِّ وَ فِي أَمْرِ الْغَائِبِ الْمُؤَكَّدِ بِالنُّونِ الْخَفِيفَةِ لِيَنْصُرَنْ لِيَنْصُرُنْ لِتَنْصُرَن وَ فِي أَمْرِ الْحَاضِرِ مُؤَكَّداً بِالنُّونِ الثَّقِيلَةِ أُنْصُرَنَّ**

«لِيَنْصُرْنَانِّ» بۆ جمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی لِيَنْصُرْنَ بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە، وە هاتین بە ئەلفێ لە بەینی نونە کانا، وە نونە ثقیلە کەمان مکسور کرد گەڕا بە لِيَنْصُرْنَانِّ.

«وَ فِي أَمْرِ الْغَائِبِ الْمُؤَكَّدِ بِالنُّونِ الْخَفِيفَةِ لِيَنْصُرَنْ» بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵە کەی لِيَنْصُرْ بوو مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە ماقبلی نونەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە لِيَنْصُرَنْ.

«لِيَنْصُرُنْ» بۆ جمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی لِيَنْصُرُوا بوو، مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە، التقاءالساکنین ڕوی دا لە بینی واو و نونە خفیفە کەدا وە حذفی واوی جمعە کەمان کرد لەبەر التقاءالساکنین ماقبلە کەمان بە مضمومی هێشتە وە بۆ ئەوە دەلالەت بکا لەسەر واوە کە گەڕا بە لِيَنْصُرُنْ.

«لِتَنْصُرَنْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب ئەصڵە کەی لِتَنْصُرْ بوو مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە ماقبلی نونە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە لِتَنْصُرَنْ.

«وَ فِي أَمْرِ الْحَاضِرِ مُؤَكَّداً بِالنُّونِ الثَّقِيلَةِ» تۆ ئەڵێیت لە ئەمری مخاطب کە ئەمری بە صیغەیە لە حاڵی تأکید بە نونی ثقیلەدا:- «أُنْصُرَنَّ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی أُنْصُرْ بوو، جا مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە أُنْصُرَنَّ.

## أُنْصُرَانٍّ أُنْصُرُنَّ أُنْصُرِنَّ أُنْصُرَانٍّ أُنْصُرْنَانٍّ وَ بِالْخَفِيفَةِ أُنْصُرَنْ أُنْصُرُنْ

«أُنْصُرَانٍّ» بۆ تشنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرا بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە نونە کەمان مکسور کرد گەڕا بە أُنصُرَانٍّ.

«أُنْصُرُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرُوا بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە، وە حذفی واوە کەمان کرد لەبەر التقاءالساکنین، و ئیکتفامان کرد بە ضمەی ماقبلە کەی گەڕا بە أُنصُرُنَّ.

«أُنْصُرِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرِي بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە.وە حذفی یێ کەمان کرد لەبەر ئیکتفا بە کسرەی ماقبلە کەی گەڕا بە أُنصُرِنَّ ...

«أُنْصُرَانٍّ» بۆ تشنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرا بوو، مؤکدمان کردبە نونی ثقیلە وە نونە کەمان مکسور کرد گەڕا بە أُنصُرَانٍّ.

«أُنْصُرْنَانٍّ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرْنَ بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە گەڕا بە أُنصُرْنَنَّ، هاتین بە ئەلفێ لە بەینی نونی جمع وە نونی تأکیدە کەدا وە نونە تأکیدە کەمان مکسور کرد گەڕا بە أُنصُرْنَانٍّ.

«وَ بِالْخَفِيفَةِ» تۆ ئەڵێیت لە ئەمری مخاطبا لە کاتی تأکید بە نونی خفیفەوە «أُنْصُرَنْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرْ بوو، مؤکدمان کردبە نونی خفیفە وە ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا أُنصُرَنْ.

«أُنْصُرُنْ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرُوا مؤکدمان

## أُنصُرِنْ وَ قِسْ عَلٰی هذا نظائِره

کرد بە نونی خفیفە وە حذفی واوە کەمان کرد لەبەر التقاءالساکنین وە ئیکتفامان بە ضمەی ماقبلە کەی کرد، بو دەلاڵەت لەسەری گەرا بە أُنْصُرُنْ.

«أُنْصُرِنْ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی أُنصُرِي بوو، مؤکدمان کرد بە نونی خفیفەوە، وە حذفی یێ کەمان کرد لەبەر التقاءالساکنین، وە ئیکتفا بە کسرەی ماقبلە کەی گەرِا بە أُنْصُرِنْ.

«وَ قِسْ عَلٰی هذا نظائِرهَ» تۆ قیاس بکە لەسەر ئەمە بابە کانی‌تر.

بیداری:لەم مثالە پێشوانە وەکە باسمان کردن، دەرکەوت کە نونی خفیفە لاحق نابی بە فعلی تثنیە و جمعی مؤنثە وە چەلە مضارعا و چەلە ئەمری بە صیغەدا، وە لە پیشە و تصریحی پێ کرد.

جا کاتێ مصنف رزگار بوولە باسی تحویلی مصدر بۆ فعلی ماضی و مضارع و ئەمر بە صیغە و نەهی و متعلقاتی ئەوانە دەستی کرد بە باسی اسمی فاعل وە اسمی مفعول، وە تحویلی مصدر بۆ ئەو صیغانە بە هۆی مضارعەوە وەفەرموی:ـ

# اسم الفاعل و المفعول من الثلاثی المجرد

**وَأَمَّا اِسْمُ الْفَاعِلِ وَالْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمُجَرَّدِ فَالأَكْثَرُ أَنْ يَجِيءَ اِسْمُ الْفَاعِلِ مِنْهُ عَلٰى فَاعِلٍ تَقول نَاصِرٌ نَاصِرَان**

---

«وَأَمَّا اِسْمُ الْفَاعِلِ وَالْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمُجَرَّدِ» مادام تـۆیته وێ صیغەی اسمی فاعل وه اسمی مفعول دروست بکەی له ثلاثی مجرد دا «فَالأَكْثَرُ أَنْ يَجِيءَ اِسْمُ الْفَاعِلِ مِنْهُ عَلٰى فَاعِلٍ» ئەوه بـزانـه زۆربـەی ئەحواڵ ئەوەیه که اسمی فاعل له ثلاثی مجرد دا لەسەر وەزنی فاعل بێ «تَقول نَاصِرٌ» جا تۆ ئەڵێیت له دروست کردنی اسمی فاعل ثلاثی مجرد دا لەسەر وەزنی فاعل(نَاصِرٌ)بۆ مفردی مذکری غائب و مخاطب و متکلم، ئەصڵه کەی يَنْصُرُ یا تَنْصُرُ یا أَنْصُرُ بوو، حذفی حرفی مضارعه کەمان کرد، وه فاء الفعله کەمان مفتوح کرد وه هاتین به ئەلفێ لەبەینی فاءالفـعلەکـەو عین‌الفعله کەدا، وه عین الفعله کەمان مکسور کرد گەڕا به نَاصِرٌ.

«نَاصِرَان» بۆ تثنیەی مذکره له حالەتی رەفعەدا، ئه صڵه کەی ناصر بوو ئەلف و نونی مکسوره علامەتی تثنیه بوو له حاڵی رەفعەدا، لاحقمان کرد پێیەوه، وه ئەلف موقتضی فتحەی ماقبله کەیەتی، ماقبله کەمان مفتوح کرد گەڕا به ناصران.

## نَاصِرَيْنِ نَاصِرُونَ نَاصِرِينَ نَاصِرَةٌ نَاصِرَتَانِ

«نَاصِرَيْنِ» بۆ تثنیەی مذكر لە حاڵەتی نەصبەو جەڕەدا ئـەصڵە کـەی ناصر بوو (ی)یێ و (ن) نون علامەتی تثنیە بوو لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا ئیلحاقمان کرد بەئاخریە وە، وە ماقبلی یێ کەمان مفتوح کرد لەبەر فەرق لە بەینی یێی تثنیە و جمع‌دا گەڕا بە ناصرَیْنِ.

«نَاصِرُونَ» بۆ جمعی مذکر لە حاڵەتی ڕەفعەدا، ئەصڵە کـەی نـاصر بوو، واو وە نون مـفتوح عـلامەتی جـمعی مـذكر بـوو لاحـقمان كـرد بـە ئاخریەوە گەڕا بە نَاصِرُونَ.

«نَاصِرِينَ» بۆ جمعی مذکر لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا، ئەصڵە کـەی نَاصِرٌ بوو، (ی)یێ ساکن و (ن)مفتوح علامەتی جمعی مذكر بوو لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا لاحقمان کرد بە ئاخریە وە، وە ماقبلی یێ کەمان مکسور کرد گەڕا بە ناصرین.

«نَاصِرَةٌ» بۆ مفردی مؤنث لە غائب و مخاطب و متكلم‌دا، ئەصڵە کەی نَاصِرٌ بوو تـێ و تـنوین عـلامەتی مـفردی مـؤنث بـو ئیلحاقمان کـرد بـە ئاخریەوە، جا(ت)تیێی تأنیث باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، مـاقبلە کـەمان مفتوح کرد گەڕا بە نَاصِرَةٌ.

«نَاصِرَتَانِ» بۆ تثنیەی مؤنث لە حاڵەتی ڕەفعەدا، ئەصڵە کەی نَاصِرَةٌ بوو ئەلف و نون علامەتی تثنیە بوو لە حاڵەتی ڕەفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلەکەمان مفتوح کرد وە حذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی ئیلتقای ساکنین کە تنوین و ئەلفە کەن گەڕا بە ناصرتان.

## نٰاصِرَتَيْنِ نٰاصِرٰاتٌ نَوٰاصِرُ

«نٰاصِرَتَيْنِ» بۆ تثنیەی مؤنث لە حاڵەتی نصبە و جڕەدا ئەصڵە کەی نٰاصِرَةٌ بوو، (ی)یێ و (ن)نون کە علامەتی تثنیەی مؤنث بون لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، یێی تثنیە باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد، وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی ئیلتقای ساکنین کە تنوین و یێ کە ن گەڕا بە ناصِرَتَيْنِ.

«نٰاصِرٰاتٌ» بۆ جمعی مؤنثی سالم ئەصڵە کەی نٰاصِرَةٌ بوو، ئەلف و تێ عەلامەتی جەمعی مؤنثی سالم بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو ماقبلە کەمان مفتوح کرد، وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر چاری ئیلتقاءالساکنین گەڕا بە ناصِرتٰاتٌ، جادو عەلامەتی تأنیث کۆ بوونە وە، حەذفی عەلامەتی جمعە کەمان نەکرد چونکی دەلالەتی ئەکرد لەسەر تأنیث وە جمعیەت، بە لاّم حەذفی علامەتی مفردە کەمان کرد چونکە تەنیا دەلاّلەتی لەسەر تأنیث کرد گەڕا بە نٰاصِرٰاتٌ.

«نَوٰاصِرُ» بۆ جمعی مؤنثی مکسر، ئەصڵە کەی نٰاصِرَةٌ بوو هاتین بە ئەلفێ لە بەینی عین‌الفعل و الفاءالفعلە کەیدا جا ئیلتقاءالساکنین پەیدا بوو، بە هۆی هەردو ئەلفە کەوە، جا قەلبی ئەلفی صیغەی فاعلمان کرد بە واو، وە عین‌الفعل کەمان مکسور کرد گەڕا بە نَوٰاصِرَةٌ، جالە بەر ئەوە ئەم صیغە مختص بوو بە مؤنثەوە، وەکو: حوائض و طوالق لە جەمعی حائض وە طالق‌دا ئیحتیاجمان نەبوو بە تێی تأنیثە کەوە حەذفمان کرد گەڕا بە نَوٰاصِرٌ.

## اسم المفعول من الثلاثي المجرد

**وَ أَمَّا اِسْمُ الْمَفْعُولِ مِنْهُ فَالْأَكْثَرُ أَنَّهُ يَجِيءُ عَلَى مَفْعُولٍ تقول مَنْصُورٌ مَنْصُورَانِ مَنْصُورَيْنِ**

---

«وَ أَمَّا اِسْمُ الْمَفْعُولِ مِنْهُ فَالْأَكْثَرُ أَنَّهُ يَجِيءُ عَلَى مَفْعُولٍ» و ئەمما اسمی مفعول لە فعلی ثلاثی مجرد ئەوە زۆرتر ئەمەیە کە دروست بکرێ لەسەر وەزنی مفعول «تقول» تۆ ئەڵێیت لە اسمی مفعولی ثلاثی مجردا: ـ

«مَنْصُورٌ» بۆ مفردی مذکری غائب، و مخاطب وە متکلم، وە ئەصڵە کەی يُنْصَرُ تُنْصَرُ أُنْصَرُ بە ئیستعمالی مضارعی بنامفعول، جا حذفی حەرفە مضارعە کەمان کرد، وە میمیکی مەفتوحەمان لە جیگە یا دانا وە هاتین بە واوی لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلە کە یا، واو باعثی ضمەی ماقبلی بوو ماقەبلە کەمان مضموم کرد تنوین علامەتی اسمی متمکن بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە مَنْصُور.

«مَنْصُورَانِ» بۆ تثنیەی مذکر لە حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵە کەی منصور بوو، ئەلف و نون مکسورە عەلامەتی تثنیە بون لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخرەیەوە، ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەرا بە منصوران.

«مَنْصُورَيْنِ» بۆ تثنیەی مذکر لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا ئەصڵە کەی منصور بوو، یێ و نون عەلامەتی تثنیە بوو لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا

## مَنْصُورُونَ مَنْصُورِينَ مَنْصُورَةٌ مَنْصُورَتَانِ

ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، جا حەذفی تنوین کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین، وە ماقبلی یێ کەمان مفتوح کرد هەتا فەرق بیی لە بەینی یی ی تثنیە و جەمع دا گەڕا بە مَنْصُورَيْنِ.

«مَنْصُورُونَ» بۆ جمعی مذکر لە حاڵەتی رەفعەدا ئەصڵە کەی مَنْصُورٌ بوو، واو و نون مفتوح عەلامەتی جەمعی مذکر بوون لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کردن بە ئاخریەوە، وە حەذفی تنوین مان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مَنْصُورون.

«مَنْصُورِينَ» بۆ جمعی مذکری سالم لە حاڵەتی نصبە و جەڕەدا، ئەصڵە کەی مَنْصُورٌ بوو، یێ و نون عەلامەتی جمعی مذکر بون لە حاڵەتی نصبە و جەرەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، وە یێ باعثی کەسرەی ماقبلە کەی بوو ماقبلە کەمان مکسور کرد وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مَنْصُورِينَ.

«مَنْصُورَةٌ» بۆ مفردی مؤنثی غائب یا مخاطب یا متکلم لەسەر موقتضای مقام، ئەصڵە کەی مَنْصُورٌ بوو، تێ وە تنوین علامەتی مفردی مؤنث بون ئیلحاقمان کردن بە ئاخریە وە، تێی تأنیث باعثی فەتحەی ماقبلی بوو ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە مَنْصُورَةٌ.

«مَنْصُورَتَانِ» بۆ تثنیەی مؤنث لە حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵە کەی مَنْصُورَةٌ بوو، ئەلف و نون عەلامەتی تثنیە بون لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کردن بە ئاخریە وە، ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە

## مَنْصورَتَيْنِ مَنْصُوراتٌ مَناصِرُ

کەمان مفتوح کرد وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مَنْصُورَتانِ.

«مَنْصورَتَيْنِ» بۆ تثنیە مؤنث لە حالەتی نصبە و جەڕەدا، ئەصڵە کەی مَنْصُورَةٌ بوو، یێ و نون عەلامەتی تثنیە بوون لە حالەتی نصبە و جەڕەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، وە ماقبلی یێ کەمان مفتوح کرد لەبەر فەرقی تنثیە و جمع، وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مَنْصُورَتَيْنِ.

«مَنْصُوراتٌ» بۆ جمعی مؤنثی سالم ئەصڵە کەی مَنْصُورَةٌ بوو، ئەلف و تێ عەلامەتی جمعی مؤنث بون ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد، وە حەذفی تنوینە کەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مَنْصُورَتاتٌ، جا ئیجتماعی دو عەلامەتی تأنیث بوو، وە دروست نەبوو حەذفی عەلامەتی جەمعە کە بکەین، چونکە تأنیث وە جمعیەتی ئە گەیاند، وە حذفی علامەتی مفردە کەمان کرد، چونکی تەنیا تأنیثی ئە گەیاند گەڕا بە مَنْصُوراتٌ.

«مَناصِرُ» عطفە لەسەر منصورات، واتە مناصریش وەکو مَنْصُوراتٌ جمعی مؤنثە بە صیغەی مکسر ئەصڵە کەی مَنْصُورَةٌ بوو، هاتین بە ئەلفێ لە بەینی فاءالفعلە کە یا، وە عینالفعلە کەمان مکسور کرد واوە کەمان حذف کرد گەڕا بە مناصرة، جا لەبەر ئەوە ئەم صیغەیە مختص بوو بە مؤنثەوە بێ ئیحتیاج بوین لە تێ تأنیثە کەو لامان برد گەڕا بە مَناصِرُ.

**وَ تَقُولُ مَمْرُورٌبِهِ، مَمْرُود بِهِمٰا، مَمْرُورٌبِهِمْ، مَمْرُورٌبِهٰا، مَمْرُورٌبِهِمٰا، مَمْرورٌبِهِنَّ**

---

«وَ تَقُولُ مَمْرُورٌبِهِ، مَمْرُود بِهِمٰا، مَمْرُورٌبِهِمْ، مَمْرُورٌبِهٰا، مَمْرُورٌبِهِمٰا، مَمْرورٌبِهِنَّ» یانی هەرکاتێ بتەوێ اسمی مفعول دروست بکەی لە فعل متعدی، ئەوە مضارعی ئەو فعلە ئەبەیتە سەر وەزنی اسمی مفعول وە حذفی فاعلەکەی ئەکەی، وە مَفْعُولٌ بِهِ ئەو فعلە ئەکەی بە نائب فاعل، وە مرفوعی ئەکەی.

وە ئەمما ئەگەر بتەوێ اسمی مفعول لە فعلی لازم دروست کەیت ئەوە پێوستە لە پێشا ئەو فعلە لازمە بکەی بە متعدی بە واسطەی حرفی جەرە وە چونکی لە پێش ئەوا ئەو فعلە لازمە بکەی بە متعدی شتێ نیە دابنری لە جێگەی فاعلی ئەو فعلا تا صیغەی اسمی مفعول دروست بکەی، وە اسنادی بدەی بۆ لای ئەو نائبی فاعلە.

جالە سەر ئەم یاسا مصنف رحمەالله تعالی فەرموی: «وتقول مَمْرُورٌ بِهِ مَمْرُورٌ بِهِمٰا»تا ئاخری یە عنی صیغەی یمرُّلە جوملەی (یمرُّ زیدٌ)کە فعلی مضارعی لازمە کاتی ویستت صیغەی اسمی مفعولی لێ دروست بکەی پێوستە بە هۆی حەرفی جەڕە و بیکەی بە متعدی بۆلای مَفْعُولٌ بِهِ وە بلێی زَیْدٌ یُمَرُّبِهِ.

جا صیغەی یُمَرُّ بکەی بە ممرور وە زید کە فاعلە حەذفی بکەی وە جار و مجرورەکە کە مفعول بە غیرە صریحە لە جێگە یا دابنی، وە اسنادی اسمە مفعولەکە بدە بۆلای وە بلێ: مَمْرُورٌبِهِ، وەهەر وەها باقی صورەتەکان وەلە

فَتُثَنِّی وَ تَجْمَعُ وَ تُذَكِّرُ وَ تُؤَنِّثُ الضَّمِيرَ فِي مٰايَتَعَدّىٰ بِحَرْفِ الْجَرِّ لَااسْمَ الْمَفْعُولِ وَ فَعِيلٌ قَدْ يَجِيءُ بِمَعْنَى الْفَاعِلِ كَالرَّحِيمِ بِمَعْنَى الرَّاحِمِ وَ بِمَعْنَى الْمَفْعُولِ كَالْقَتِيلِ بِمَعْنَى الْمَقْتُولِ

---

هەمویانا اسمە مفعولە کە لەسەر حاڵی افراد و تذکیر ئە مێنێتەوە، بە وێنەی فعلێ اسناد بدرێ بۆلای فاعلی ظاهر، وە ئەوەی پێوستە لە تثنیە و جەمع وە تذکیر و تأنیث لە نائب فاعلە کەدا کە جار و مجرورەکەیە دەرئەکەوێ وەکو مصنف فەرمویەتی: «فَتُثَنِّی وَ تَجْمَعُ وَ تُذَكِّرُ وَ تُؤَنِّثُ الضَّمِيرَ فِي مٰايَتَعَدّىٰبِحَرْفِ الْجَرِّ لَااسْمَ الْمَفْعُولِ» یانی تۆ تثنیە و جمع و تذکیر و تأنیث دینی بە سەر ئەو ضمیراکە مجرور بووە بە حەرفە جەرەکە، لەهەر اسمی مفعولێک لە لازم بوو بێ‌وە بوبێ بە متعدی بە هۆی حەرفی جەرە وە، ئەوە دەست لە اسمە مفعولە کە نادەیت چونکە ئەو جار و مجرورە بووە بە نائب فاعل، وە هەر مشتقێ اسناد بدرێ بۆلای فاعل یا نائب فاعل بە مفردی و مذکری ئەمێنێتەوە.

جا لە بەر ئەوە مصنف رحمەالله تعالی لە مەوپێش فەرموی ئەکثروایە اسمی فاعلی ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی فاعل، وە اسمە مفعولە کەیشی لەسەر وەزنی مفعول بێ ویستی باسی مقابلی ئەو ئەکثرەش بکات وە فەرموی:ـ «وَ فَعِيلٌ قَدْ يَجِيءُ بِمَعْنَى الْفَاعِلِ كَالرَّحِيمِ بِمَعْنَى الرَّاحِمِ وَ بِمَعْنَى الْمَفْعُولِ كَالْقَتِيلِ بِمَعْنَى الْمَقْتُولِ» یانی کەم جار اسمی فاعل وە اسمی مفعولی ثلاثی مجرد لەسەر وەزنی فاعل وە مفعول نابن بەڵکو لەسەر وەزنی فعیل ئەبێ وەکو(رحیم)کە بە معنای راحمە، وە مشتقە لە

..........................................................................

يَرْحَمُ، حذفی حەرفە مضارعە کەمان کرد، وە فاءالفعلە کەمان مفتوح کرد، وە عین‌الفعلە کەمان مکسور کرد، و هاتین بە یێ یەکی ساکنە لە بەینی عین‌الفعلەکە و لام‌الفعلەکە یدا گەڕا بە رَحیم.

وە مثالی ئەو اسمە مفعولە لە سەر وەزنی فعیل بێ وەکو قتیل کە بە مەعنای مقتول مشتقە لە يُقْتَلُ بە صیغەی بنا مفعول، حەرفە مضارعە کەمان حەذف کرد، وە فاءالفعلە کەمان مفتوح کرد، وە هاتین بە یێ‌یەکی ساکنە لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلەکە یاگەڕا بە (قتیل).

## اسم الفاعل و المفعول من مازاد على الثلاثة

وَ أَمَّا مٰازٰادَ عَلَى الثَّلاٰثَةِ فَالضّٰابِطَةُ فِيهِ أَنْ تَضَعَ الْمِيمَ الْمَضْمُومَةَ مَوْضِعِ حَرْفِ الْمُضٰارِعَةِ وَ تَكْسِرَ مٰا قَبْلَ الآخِرِ فِي اسْمِ الْفٰاعِلِ وَ تَفْتَحَهُ فِي اسْمِ الْمَفْعُولِ نحو مُكْرِمٌ وَ مُكْرَمٌ

---

جاکاتێ کە مصنف نەجاتی بوو لە باسی اسمی فاعل وە اسمی مفعولی ثلاثی مجرد، دەستی کرد بە باسی اسمی فاعل وە اسمی مفعول لە غیری ثلاثی مجردا وەکو ثلاثی مزید و رباعی مجرد و مزید فیە وە فەرموی:

«وَ أَمَّا مٰازٰادَ عَلَى الثَّلاٰثَةِ» وە ئەمما اسمی فاعل وە اسمی مفعول لە فعلێک دا زیاتربێت لەسەر سێ حەرف «فَالضّٰابِطَةُ فِيهِ أَنْ تَضَعَ الْمِيمَ الْمَضْمُومَةَ مَوْضِعِ حَرْفِ الْمُضٰارِعَةِ وَ تَكْسِرَ مٰا قَبْلَ الآخِرِ فِي اسْمِ الْفٰاعِلِ وَ تَفْتَحَهُ فِي اسْمِ الْمَفْعُولِ» ئەوە قاعدەی کلیە بۆ دروست کردنیان ئەوە یەکە میمێکی مضمومە دابنی لە جێگەی حەرفی مضارعا، وە حرفی پێش ئاخری مکسور بکەی لە اسمی فاعلدا وە مفتوحی بکەی لە اسمی مفعولدا «نحو مُكْرِمٌ» بۆ اسمی فاعل بابی افعال مشتقە لە يُكْرِمُ هاتین بە میمێکی مضمومە لە جێگەی حەرفی مضارعدا، وە ماقبلی ئاخرە کەمان مکسور بوو هێشتمانە وە گەڕا بە مُكْرِمٌ.

«وَ مُكْرَمٌ» بۆ اسمی مفعول لە بابی افعال هاتین بە میمێکی مضمومە لە جێگەی حەرفی مضارعا وە ماقبلی ئاخرە کەمان مفتوح کرد بۆ ئەوە فەرقی ببێ لە بەینی اسمی فاعل وە اسمی مفعولدا گەڕا بە مُكْرَمٌ.

ومُدَخرِجٌ و مُدَخرَجٌ و مُسْتَخْرِجٌ و مُسْتَخْرَجٌ وَ قَد يَسْتَوِى لَفْظُ الْفاعِلِ و الْمَفْعُولِ بَعْضِ الْمَواضِعِ كَمُحٰابٌّ و مُتَحٰابٌّ ومختار و مُضْطَرٌّ و مُعْتَدٌّ و مُنْصَبٌّ و مُنْصَبٌّ فَيهِ وَ يَخْتَلِفُ التَّقْدِيرُ

---

«ومُدَخرِجٌ و مُدَخرَجٌ و مُسْتَخْرِجٌ و مُسْتَخْرَجٌ» به ضمەی میمی هەموویان، وەکسرەی ماقبل ئاخر لە اسمی فاعل، وە فتحەی ماقبلی ئاخر لە اسمی مفعول‌دا، وە دروست کردنیان وەکو مُکرِم مُکْرَمٌ وایە.

«وَ قَد يَسْتَوِى لَفْظُ الْفاعِلِ و الْمَفْعُولِ بَعْضِ الْمَواضِعِ» وەکە مێ جار صیغەی اسمی فاعل وە اسمی مفعول وەکو یەکیان لێ‌دێ لە لفظا خوای بە هۆی: ـ دەغمی ماقبلی ئاخرەکەی لە ئاخرەکە یانا «کَمُحٰابٌّ» بۆ اسمی فاعل و اسمی مفعول بابێ مفاعله «و مُتَحٰابٌّ» بۆ اسمی فاعل و اسمی مفعولی بابی تفاعل «و مختار» بۆ اسمی فاعل و اسمی مفعولی بابی افتعال لە معتل‌العین «و مُضْطَرٌّ و مُعْتَدٌّ» بۆ اسمی فاعل و اسمی مفعولی بابی افتعال «و مُنْصَبٌّ» بۆ اسمی فاعل بابی انفعال.

«و مُنْصَبٌّ فَيهِ» بۆ اسمی مفعول عەینی ئەو بابە ـ بابی انفعال ـ ئیستە اسمی فاعل و اسمی مفعول لە هەموویانا یەکێکە. وە یا بە هۆی اعلال کردنی عین‌الفعل وە قەلبی واو و یێ بە ئەلف بێ وەکو مختار بۆ اسمی فاعل وە اسمی مفعولی بابی افتعال «و مُنْجٰاب» بۆ اسمی فاعلی بابی انفعال «و مُنْجٰاب عَنْهُ» بۆ اسمی مفعول عەینی باب ـ انفعال ـ ئیستە اسمی فاعل و اسم مفعول لەم سێ لفظانە وەکو یەکن، «وَ يَخْتَلِفُ التَّقْدِيرُ» بە لاّم تقدیر وە ئەصڵی مقدەرەی ئەو لفظانە کە اسمی فاعل بن جیاوازە لەگەڵ ئەصڵی مقدری ئەو لفظانە کە اسمی مفعول بن چونکی ماقەبلی ئاخر لە اسمە

............................................

فاعلە کانا مکسورە، وەلە اسمە مفعولە کانا مفتوحە مثلاً ئەصڵی پێنج صیغە ئەوەڵە کان: مُحْابِبٌ وە مُتَحْابِبٌ وە مضطرِرٌ وە متَعَدِدٌ و مُنْصَبِبٌ بوو، بە کسرەی حەرفی ماقبلی ئاخر بۆ اسمی فاعل.محابَبٌ وە متحابَبٌ وە مضطرَرٌ وە متعدَدٌ و منصبَبٌ فیە، بە فتحەی حەرفی ماقبلی ئاخر بۆ اسمی مفعول، وە لە هەمویانا اجتماع المثلین ڕوی دا، وە حەذفی حەرەکەی مثلی ئەوەڵمان کرد، وە دەغممان کرد لە مثلی ثانیدا.وە.ئەصڵی سێ لفظە دواییە کان مختیرٌ وە منجوبٌ بو بە کسرەی ماقبلی ئاخر لە اسمی فاعلدا وە مختیَرٌ وە منجوَبٌ عنهُ بوو، بە فتحەی ماقبلی ئاخر لە اسمی مفعولدا، وە بە یاسای اعلال واو وە یێ متحرک وە ماقبل مفتوح قەلبمان کردن بە ئەلف وە بون بەو لفظانە کە تەماشات کرد.

جا کاتێ مصنف رزگاری بوو لە باشی فعلی ماضی وە مضارع وە ئەمر بە، لام وە نەهی بە لا وە ئەمری بە صیغە وە اسمی فاعل وە اسمی مفعول ـ وە ئەم صیغانە بەکار دین لە سالم وە غیرە سالمدا وەکو: ـ مضاعف وە معتل وە مهموز.وە بۆ ئەم سێ نەوعە بازێ ئەحواڵی وابوو کە مختص بوو بە خویانەوە وە زۆر جێگەی ئیعتبار وە اهتمام بوون، مصنف هات ئەم باسانەی دەست پێ کرد بە ترتیب، وە خستنیە پێش باسی باقی ئەو صیغانە کە لە تحویلی مصدەرە وە پەیدا ئەبن، وەکو اسمی زەمان و مەکان و ئالەت وە مصدەر بێ وە فەرموی: ـ

# «فَصْلٌ فِى الْمُضٰاعَفِ»

## فَصْلٌ فِى الْمُضٰاعَفِ يُقٰالُ لَهُ الأَصَّمُ وَ هُوَ مِنَ الثُّلاٰثِيّ الْـمُجَرَّدِ وَ الْمَزِيدِ فِيهِ مٰا كٰانَ عَيْنُهُ وَ لاٰمُهُ مِنْ جِنْسٍ وٰاحِدٍ

---

واته ئەمە فەصڵێكە لەباس وە بەیانی ئەو مشتقانە كە مضاعفن، جا بزانن كە لفظی مَضٰاعَف اسمی مفعولە لە لوغەتی عەرەبانا بە شتێك ئەڵێن كە دو چەندانە كرابێتە وە، وە لە عورفی ئەهلی علمی صەرفا تعریفی ئەوەیە كەلەمتنە كەدا دێت: «يُقٰالُ لَهُ الأَصَّمُ» وە بە مضاعف ئەوترێ (أصمّ)یانی كەڕ بە و مناسەبەتە هەر وەكو گوێچكەی كەڕبێ، كە ناوە كەی توندو پڕئەبێ لە گۆشت یالە ژەنگ، ئەو لفظەیش كە مضاعف بێ توند و پڕئەبێ بە هۆی ئەو دوو حەرفەوە كە ئەوەڵیان دەغم ئەكرێ لە دوهە میانا...

«وَ هُوَ مِنَ الثُّلاٰثِيّ الْمُجَرَّدِ وَ الْمَزِيدِ فِيهِ مٰا كٰانَ عَيْنُهُ وَ لاٰمُهُ مِنْ جِنْسٍ وٰاحِدٍ» مضاعف لە عورفی ئەهلی صەرفا لە ثلاثی مجرد و مزید فیەدا، فعلێكە یا اسمێكە عین‌الفعل وە لام‌الفعلی لە یەك نەوعە حەرف بن «كَرَدَّ و أَعَدَّ» وەكو رَدَّ لە ثلاثی مجرد كە ماضی بابی ئەوەڵە وە أَعَدَ لە ثلاثی مزید فیەدا كە ماضی بابی افعالە «فَإِنَّ أَصْلَهُمٰا رَدَدَ وَ أَعْدَدَ» بە راستی ئەصڵی یەكە میان رَدَدَ، وە ئەصڵی دووهە میان أَعْدَدَ بوە، جا حەذفی حەرەكەی دالی ئەوەڵمان كردوە وە دەغممان كرد لە ثانی دابون بە رَدَّ و أَعَدَّ....

«وَ مِنَ الرُّبٰاعِيِّ مٰا كٰانَ فٰائُهُ وَ لاٰمُهُ الأُولٰى وَ كَذٰا عَيْنُهُ وَ لاٰمُهُ الثّٰانِيَةُ مِنْ جِنْسٍ وٰاحِدٍ» وە مضاعف لە عورفی ئەهلی صەرفا لە فعلی

**فَإِنَّ أَصْلَهُمٰا رَدَدَ وَ أَعْدَدَ وَ مِنَ الرُّبٰاعِيِّ مٰا كٰانَ فٰائُهُ وَ لاٰمُهُ الْأُولىٰ وَ كَذٰا عَيْنُهُ وَ لاٰمُهُ الثّٰانِيَةُ مِنْ جِنْسٍ وٰاحِدٍ وُ يُقٰالُ لَهُ الْمُطٰابَقُ نحو: زَلْزَلَ، يُزَلْزِلُ، زَلْزَلَةً وَ زِلْزٰالاً وَ اِنَّمٰا أُلْحِقَ الْمُضٰاعَفُ بِالْمُعْتَلاّٰتِ لأَنَّ حُرُوفَ التَّضْعِيفِ يَلْحَقُهُ اَلِْأبْدٰالُ**

---

رباعی مجرد یا مزید فیەدا ئەوەیە: ـکە فاءالفعل وە لامالفعلی ئەوەڵی هەروا عینالفعل وە لامالفعلی دوهەمی لەیەک نەوعە حەرف بن....

«وُ يُقٰالُ لَهُ الْمُطٰابَقُ» وە مضاعفی رباعی وەکو ناو ئەبرێ بە مضاعف، پێشی ئەوترێ مطابَق بە فتحەی بێ مەعنای مُطابَق فیە یانی بەرانبری و ریزاوەری کراوە تیایدا لە بەینی دوو حەرف دا کە عیبارەتن لە فاءالفعل وە لامالفعلی ئەوەڵ وە عینالفعل و لامالفعلی ثانی «نحو: زَلْزَلَ، يُزَلْزِلُ، زَلْزَلَةً وَ زِلْزٰالاً» ئیستە مطابقە و موافقە کراوە لە بەینی حەرفە کانیا بەو نەوعەوتمان....

جا ئەگەر کە سێ پرسیاری کرد بۆ مضاعف بە غەیرە سالم وە لە جوملەی معتلا تا دانراوە مع أنە یە کێ لە حروفی علّەی تیانیە، جوابی بدەرەوەو بڵێ: «وَ اِنَّمٰا أُلْحِقَ الْمُضٰاعَفُ بِالْمُعْتَلاّٰتِ لأَنَّ حُرُوفَ التَّضْعِيفِ يَلْحَقُهُ اَلِْأبْدٰالُ» نە وەکو مضاعف ئیلحاق کراوە بە معتلاتەوە ئیلالە بەر ئەوە کە حەرفی تضعیف گوڕانە وەی بە حەرفێکی تری بە سەردا دێت، وەکو حروفی عللە گوڕانە وەیان بە سەرادیت بە حەرفێکی تر، والەم حاڵی ئیبدالە مناسبە پەیدا بوو لە بەینی معتلات و مضاعفدا وە مضاعف ئیلحاق کرا بە معتلەوە.جا مثالی هاتنی ابدال بەسەر مضاعفا «کَقَوْلِهِمْ

كَقَوْلِهِمْ أَمْلَيْتُ بِمَعْنى أَمْلَلْتُ وَ كَذٰلِکَ الْحَذْفُ كَقَوْلِهِمْ مَسْتُ وَ ظَلْتُ بفتح الفاء و كسرها و أَحَسْتُ

أَمْلَيْتُ بِمَعْنى أَمْلَلْتُ» وەکو قەولی عەرەبان ئەڵێن أَمْلَيْتُ بە گورینەوەی لامی ثانی بە (ی)یێ.چونکە ئەصڵە کەی أَمْلَلْتُ بوە یانی نوسیم «وَ كَذٰلِکَ الْحَذْفُ» وە هەر وەکو ابدال دێ بە سەر حروفی تضعیفدا، حەذفیش دێت بە سەریانا، وەکو حەذف دێ بەسەر حروفی علەدا وە بەم وەزعەیش مناسبە لەبەینی مضاعف و معتلا پەیدا بووە، وە مضاعف ئیلحاق کراوە بە معتلاتە وە ـ جا مثالی هاتنی حەذف بەسەر مضاعفا «كَقَوْلِهِمْ مَسْتُ وَ ظَلْتُ بفتح الفاء و كسرها و أَحَسْتُ» ئەصڵەکەیان مَسِسْتُ و ظَلِلْتُ و أَحْسَسْتُ بوە ئیستە لە دو مثالە ئەوەڵەکانا حەذفی عین‌الفعلەکەمان کرد بە خوێو حرەکە یەوە گەڕا بە مَسْتُ و ظَلْتُ بە فتحەی فاءالفعل یا خود نقڵی کسرەی عین‌الفعلەکانمان کرد بۆلای فاءالفعلەکەیان، ئەو جار حەذفمان کرد گەڕان بە مِسْتُ و ظِلْتُ بە کسرەی فاءالفعل.وەلە مثالی ئاخرا ئەصڵەکەی أَحْسَسْتُ بوو، وەکو أَكْرَمْتُ حەذفی سینی ئەوەڵمان کرە لە پاش نەقڵی فەتحەکە بۆلای ماقبلەکەی گەڕا بە أَحَسْتُ.

خولاصە دەر کەوت بۆت کە هۆی ئیلحاقی مضاعف بە معتلە وە ئەمەیە کە مشابهە بە معتل لە هاتنی ابدال و حەذف بەسەر حروفی تضعیفەکەدا وەکو بەسەر حروفی علەدا دێت.بێجگە لە مەلەکاتی ابدال دا، ئەو حەرفەکەلەبدەلی حەرفی تضعیفدادێت‌عبارەتەلە(ی)یێ‌وەکو حاڵی بووی

وَالْمُضاعَفُ يَلْحَقُهَاالإِدْغامُ وَ هُوَ أَنْ تُسْكِنَ الأَوَّلَ وَ تُدْرِجَ فِي الثّانِي وَ يُسَمَّى الأَوَّلُ مُدْغَمًا وَالثّانِي مُدْغَماً فِيهِ وَ ذٰلِكَ واجِبٌ فِي نَحْوِ مَدَّ يَمُدُّ وَ أَعَدَّ يُعِدُّ وَانْقَدَّ يَنْقَدُّ وَاعْتَدَّ يَعْتَدُّ وَاسْتَعَدَّ يَسْتَعِدُّ وَاطْمَأَنَّ يَطْمَإِنُّ

---

له أمليت له باتی أمللت سابقاً «وَالْمُضاعَفُ يَلْحَقُهَاالإِدْغامُ» ئەمە بە یانە بۆ هێندێ لە ئەحواڵی مضاعف یانی ئەو دو حەرفە مکررە کە وان لە مضاعف داگەلێ جار ئیدغامیان بە سەردایێت «وَ هُوَ أَنْ تُسْكِنَ الأَوَّلَ وَ تُدْرِجَ فِي الثّانِي» وە ادغام لە عورفی ئەهلی تجوید و ئەهلی صەرفدا ئەمەیەکە حەرفی ئەوەڵ لەو دوحەرفە مکرەرە ساکن بکەی، وە دغمی بکەی لە حرفی ثانیدا، وە بیخوێنیتە وە بە توندی بۆ پارێزگاری لە فەوتانی «وَ يُسَمَّى الأَوَّلُ مُدْغَمًا وَالثّانِي مُدْغَماً فِيهِ» وە حەرفی ئەوەڵ ناو ئەبرێ بە مُدْغَم وە دوهەم بە مُدْغَمٌ فیه یانی دغم تیاکراو.. جابزانە ادغام لەسەر سێ قسمە: یەکەم: واجبە، دوهەم: محاڵە، سێهەم: جائزە و بە ئارەزوی انسانە وە مصنف رحمه الله تعالی بۆ بەیانی ئەم قسمانە فەرموی: ـ«وَ ذٰلِكَ واجِبٌ فِي نَحْوِ مَدَّ يَمُدُّ وَ أَعَدَّ يُعِدُّ وَانْقَدَّ يَنْقَدُّ وَاعْتَدَّ يَعْتَدُّ وَاسْتَعَدَّ يَسْتَعِدُّ وَاطْمَأَنَّ يَطْمَإِنُّ» یانی ادغام واجبە لەهەر فعلێک داکە ضمیری بارزی لەگەڵ دانەبێ لە فعلی ماضی و مضارعی مضاعفی ثلاثی مجردا مطلقا، وە لە ثلاثی مزید فیە وە رباعی مزید فیە بە مەرجێ کە دو حەرفە مکرەرەکان پێکە وەبن خوای مضاعفی عورفی بن وەکو أعدَّ، یُعدُّ و انقدَّ، یَنقدُّ و اعتدَّ، یَعتدُّ و استعدَّ، یَستعدُّ.یا خود هەر مضاعفی لوغەوی بن

وَ كَذٰا اِذٰا بَنَيْتَهٰا لِلْمَفْعُولِ وَ كَذٰا نَظٰائِرُهُ وَ فِي نَحْوِ مَدٍّ مَصْدراً وَ كَذٰلِكَ اِذٰا اِتَّصَلَ أَلِفُ الضَّمِيرِ أَوْ وٰاوُهُ أَوْيٰائُهُ نحو مَدّا، مَدّوا مُدِّي

---

وەکو اسودَّ، يَسودُّ وە اسوادَّ، يَسوادُّ و اطمأنَّ، يَطمئِنُّ.ئيستە ئەم شەش فعلە مضاعفی عورفی و اصطلاحی نین، وە بەر تعريفی ئەوە ناکەون بەڵکو هەر لامالفعلە کەيان مکررە، وە مضاعفی لوغەوين مع أنە ادغام لە وانا واجبە «وَ كَذٰا اِذٰا بَنَيْتَهٰا لِلْمَفْعُولِ» وە هەر وەها ادغام واجبە لەو فعلانە دا کاتێ کە دروستيان بکەی بۆ ئەوە نسبەتيان بدرێ بۆلای مفعول «نحو مُدَّ، يُمَدُّ»بۆ بنامفعولی ماضی و مضارعی مضاعفی بابی ئەوەڵ «وَ كَذٰا نَظٰائِرُهُ» هەروايە حوکمی‌ها و وێنەکانی مُدیُمَدّ وەکو أعدَّ، يُعَدُّ وە باقی فعلەکان کاتێ بناکران بۆ مفعول «وَ فِي نَحْوِ مَدٍّ مَصْدراً» هەم ادغام واجبە لە هاو وێنەی لفظی مَدٍّ لە و مصدەرە مضاعفانە کە شەرتی ادغاميان تێداهاتوە تەجێگە «وَ كَذٰلِكَ اِذٰا اِتَّصَلَ أَلِفُ الضَّمِيرِ أَوْ وٰاوُهُ أَوْيٰائُهُ» هەر وەها ادغام واجبە کاتێ کە ضميری فاعلی ساکن بلکی بە فعلەوە کە عبارەتن لە: ئەلف کە ضميری فاعلی تثنيەيە، وە واو کە ضميری فاعلی جمعە، وە (ی)يی کە ضميری فاعلی مفردی مؤنثی مخاطبە «نحو مَدّا، مَدّوا» بە فتحەی ميم بۆ تثنيە و جمعی فعلی ماضی بنافاعل.وە بە ضمەی ميم بۆ تثنيە و جمعی فعلی ماضی بنامفعول.يا بۆ تثنيە و جمعی فعلی ئەمری بە صيغە.وە «مُدِّي» بۆ ئەمری مفردی مؤنثی مخاطب بە ضمەی ميم، وە ادغام لە هەموو ئەمانەو وێنە ياندا واجبە جا کاتێ کە قسمی ئەوەڵی باسکرد کە ادغامی واجبە ويستی قسمی دوەم باس بکات کە ادغامی

وَ مُمْتَنِعٌ فِي نَحْوِ مَدَدْتُ وَ مَدَدْنَا و مَدَدْتَ اِلٰى مَدَدْتُنَّ و يَمْدُدْنَ و تَمْدُدْنَ و أُمْدُدْنَ و لَاتَمْدُدْنَ

محاڵە وە فەرموی:

«وَ مُمْتَنِعٌ» عەطفە لە سەر قەولی مصنف کە فەرموی واجب یانی ادغام محاڵە وە قابل نیە «فِي نَحْوِ مَدَدْتُ وَ مَدَدْنَا و مَدَدْتَ اِلٰى مَدَدْتُنَّ و يَمْدُدْنَ و تَمْدُدْنَ و أُمْدُدْنَ و لَاتَمْدُدْنَ» واتە ادغام نایتە جێگە وە وجودی محاڵە لەهەر فعلە مضاعەفێک‌دا کە ضمیری مرفوعی متحرکی پێوە لکابێ خوای فعلی ماضی بێ وەکو (مَدَدْتُ)بۆ متکلمی وحدە (وَمَدَدْنَا)بۆ متکلمی مع‌الغیر (وَمَدَدْتَ)بۆ مفردی مذکری مخاطب مَدَدْتُمَا و مَدَدْتُمْ و مَدَدْتِ وَ مَدَدْتُمَا وَ مَدَدْتُنَّ کە صیغەی جمعی مؤنثی مخاطبە و يَمْدُدْنَ بۆ جمعی مؤنثی غائب لە مضارعا، وامْدُدْنَ و لَاتَمْدُدْنَ، لە ئەوەڵیان صیغەی جمعی مؤنثی مخاطبە لە ئەمری مخاطبا، وە دوهەمیان صیغەی نهی‌یە لە جەمعی مؤنثی مخاطبا.

والحاصڵ لە هەموو مادەی اتصالی ضمیری مرفوعی متحرک بە فعلی ماضی یا مضارعە وە، ادغام محاڵە لەبەر ئەوە شەرتی ادغام ئەمەیە: - ئەوەڵ حەرف ساکن وە ثانی متحرک بێ، وەلە و فعلانا بە عەکسە وەیە کە وابێ دەغم قابل نیە لە هەر دوو متکلم وە هەموو صیغە کانی مخاطب وە جمعی مؤنثی غائب لە ماضی داوە لە صیغەی جمعی مؤنثی مخاطب لە ئەمری بە صیغەدا: لەبەر ئەوە شەرتی ادغامیان تیا نایتە جێگە وەکو وتمان.

وَ جٰائِزٌ اِذَا دَخَلَ الْجٰازِمُ عَلٰى فِعْلِ الْوٰاحِدِ فَاِنْ كٰانَ مَكْسُورَ الْعَيْنِ: كَيَفِرُّ، أَوْ مَفْتُوحه كَيَعَضُّ فَتَقُولُ: لَمْ يَفِرَّ وَ لَمْ يَعَضَّ بكسر اللام و فتحها وَ لَمْ يَفْرِرْ وَ لَمْ يَعْضَضْ بِالْفَكِّ

---

«وَ جٰائِزٌ» عەتفە لەسەر قەولی مصنف كە فەرموی «وَمُمْتَنِعٌ»، یانی ادغام دروستە نە محاڵە و نە واجبە.

«اِذَا دَخَلَ الْجٰازِمُ عَلٰى فِعْلِ الْوٰاحِدِ» كاتێ كە عاملی جازم داخڵ ببێ لە سەر فعلی مفرد لە صورەتا چە مفردی مذكری غائب یا مفرەدی مؤنثی غائب یا مفردی مذكری مخاطب یا فعلی متكلمی وحدە بێ یا متكلمی مع‌الغیر كە والە صورەتی مفرددا هەر چەن لە مەعنادا جمع بێ، بەڵام مفردی مؤنثی مخاطب نیە لەم قاعدەدا لە بەر ئەوەلە مواردی ادغامی واجبە.

«فَاِنْ كٰانَ مَكْسُورَ الْعَيْنِ: كَيَفِرُّ، أَوْ مَفْتُوحه كَيَعَضُّ فَتَقُولُ: لَمْ يَفِرَّ وَ لَمْ يَعَضِّ بكسر اللام و فتحها» جا ئەگەر ئەو فعلە مضارعە مكسورالعین بوو، وەكو: يَفِرُّ كە لە بابی ثانی یە یا مفتوح‌العین بوو وەكو: يَعَضُّ كە لە بابی رابعە ئەوە ئەتوانی بڵێیت لَمْ يَفِرِّ وَ لَمْ يَعَضِّ بە كسرەی لام‌الفعل وە لم يفرَّ و لم يَعَضَّ بە فتحەی لام‌الفعل.

«وَ لَمْ يَفْرِرْ وَ لَمْ يَعْضَضْ بِالْفَكِّ» وە ئەیش توانی بڵێیت لَمْ يَفْرِرْ وَلَمْ يَعْضَضْ بە فەككی ادغام ئەصڵە كەیان يَفِرُّ وە يَعَضُّ بوو، عاملی جازمیان داخڵ بوە سەر، وە حەذفی حەرەكەی لام‌الفعلە كە یانی كرد جالە بەر ئەوە كە لە حاڵی ادغاما حەرفی ئەوەڵ لە مكرەرەكان ساكن كرابو التقاءالساكنین ڕوی دالە بەینی ئەواندا، جابۆ دەفعی التقاءالساكنین یا ادغامە كە بهێڵینەوە

**وَ هٰكَذٰا حُكْمُ يَقْشَعِرُّ و يَحْمَرُّ و يَحْمٰارُّ وَ اِنْ كٰانَ الْـعَيْنُ مَـضْمُوماً فَيَجُون الْحَرَكٰاتُ الثّلاثُ مَعَ الأِدْغٰامِ وَ يَجُوزُ فَكُّهُ**

---

وە حەرفی ثانی متحرک ئەکەین بەکسرە لە بەر قاعدەی: (السّاكِنُ إِذٰا حُرِّكَ حُرِّكَ بِالكَسْرِ)یا بە فتحە لە بەر ئەوە فتحە (أَخَفُّ حَرَكٰاتٍ)ـوە ئەڵین لم يَفِرِّ و لم يَعَضِّ بە ادغام لە گەڵ کسرەی لامالفعل دا، وە یا لە گەڵ فتحەی لامالفعل دا، وە یا خود فەککی ادغامەکە ئەکەینەوە وە حەرەکەی ساکنی ئەوەڵ ئیعادە ئەکەینە وە لە سەر ئەساسی پێش ادغام وە ئەڵێن: ـلَمْ يَفْرِرْ وَ لَمْ يَعْضَضْ.

«وَ هٰكَذٰا حُكْمُ يَقْشَعِرُّ و يَحْمَرُّ و يَحْمٰارُّ» وە بە وێنەی يَفِرُّ، يَعَضّ وایە لە جوازی ابقای ادغام وە متحرک کردنی لامالفعلەکەدا بەکسرە یا بە فتحە، وە لە جوازی فککی ادغام وە ئیعادەی حەرەکە ساکنی ئەوەڵ کاتی دخول جازم لەسەر مضارع حوکمی ئەم سێ فعلانە و هاو وێنەیان لەهەر مادە یەکدابێت.

«وَ اِنْ كٰانَ الْعَيْنُ مَضْمُوماً فَيَجُون الْحَرَكٰاتُ الثّلاثُ مَعَ الأِدْغٰامِ وَ يَجُوزُ فَكُّهُ» یانی ئەگەر عینالفعلی ئەو فعلە مضارعە مضاعفەکە عاملی جازمی داخڵ ئەبێتە سەر مضموم بێ وەکو: يَمُدُّ و يعدُّ ئەوە دروستە لە لامالفعلە کە یانا حەرەکاتی ثەلاثە، لە گەڵ هێشتنە وەی ادغامەکەدا، جا دروستی کسرە و فتحە لەبەر ئەوەیە کە زو وتمان، وە دروستی ضمەیش لەبەر مناسبەی حەرەکەی عینالفعلە کە یەتی، هەروەها دروستە فەککی ادغامەکە بکە یتەوە، وە ساکنی ئەوەڵ متحرک بکەی بە حرەکەی پێشوی

**فتقول لَمْ يَمُدُّ بِحَرَكَاتِ الّدالِ مَعَ الِأَدْغَامَ وَ لَمْ يَمْدُدْ بِفَكِّهِ وَ هٰكَذٰا حُكْمُ الأَمْرِ فَتَقُولُ فَرَّ، فَرِّ، عَضَّ، عَضِّ وَافْرِرْ، وَاعْضَضْ**

---

خۆی، «فتقول لَمْ يَمُدُّ بِحَرَكَاتِ الّدالِ مَعَ الِأَدْغَامَ وَ لَمْ يَمْدُدْ بِفَكِّهِ» جاتۆ ئەڵێی لە مضارعی مضاعفی بابی ئەوەڵ دا لە کاتی دخولی عاملی جازم لەسەری، لم یمِدَّ بە کسرە و فەتحە و ضمەی دالە کەی لە گەڵ هێشتنە وەی ادغامی عین‌الفعل لە لام‌الفعلە کە یا وە لم یَمْدُدْ بە فەککی ادغام وە جەزمەی دالە کەی، وە ئەصڵی لم یمدَّ، یمدُّ بوو بە ادغامی دالی ئەوەڵ لە دالی ثانی‌دا، عاملی جەزمەمان داخل کردە سەری لام الفعلەکەی مجزوم کردوە التقاءالساکنین روی دا لەبینی عین‌الفعل و لام‌الفعلە کە یا وە بو چارە کردنی ئەوە لام‌الفعلە کەمان مکسور کرد یا مفتوح کرد یا مضموم کرد لەبەر ئەوەی کە لە پێشەوە وتمان، وە ادغامە کەمان هێشتە وە گەڕا بە لم یمدَّ بە یەکی لەسی حەرەکە کان، وە یا فەککی ادغامە کەمان کردەوە، و اعادەی ضمەی عین‌الفعلە کەمان کردە وە گەڕا بە لم یمدد....

«وَ هٰكَذٰا حُكْمُ الأَمْرِ» وە بە وێنەی مضارعی مضاعف وایە لە کاتی دخولی جازم دا حوکمی ئەمری بە صیغە، واتە ئەگەر لە مکسورالعین وە مفتوح‌العین دروست بکرێت ئەتوانی ادغامە کەی بێڵیتەوە، وە چاری التقاءالساکنین بکەی بە کسرە یا بە فتحەی لام الفعلە کەی.وە ئەشتوانی فەککی ادغامە کەی بکە یتەوە، لە گەڵ اعادەی حەرەکەی عین‌الفعلە کە یا «فَتَقُولُ فَرَّ، فَرِّ، عَضَّ، عَضِّ» بە هێشتنە وەی ادغام لە گەڵ کسرە یا فتحەی عین الفعلە کەیانا «وَافْرِرْ، وَاعْضَضْ» بە فککی ادغام وە اعادەی

حرەکەی عین الفعلە کەیان.

ئەصڵە کەیان تَفِرُّ و تَعَضُّ بو بە ادغام: (ت)تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە ئاخرەکانمان مجزوم کرد بە سکون جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلە کەیاندا، جا بۆ دەفعی ئەوە یا ادغامە کەمان هێشتەوە، وە لام‌الفعلە کەمان مکسور یا مفتوح کردن، وە یا خود فەککی ادغامە کەمان کردەوە وە حەرەکەی عین‌الفعلە کەمان هێنایەوە، وە جەلبی هەمزەی وەصڵمان کردە وە بودەفعی ابتدا بە ساکن گەڕان بە اِفْرِرْ وَاعْضَضْ: «وَ تَقُولُ مُدِّ وَأَمْدُدْ» تۆ ئەڵێ‌ی بە بنای ئەمری بە صیغە لە مضارعی مضموم‌العین‌دا مدٍّ بە هێشتنەوەی ادغام وە حەرەکاتی ثلاثەی لام‌الفعلە کەی لەسەر یاسای پێشو، وأُمْدُدْ بە فەککی ادغام وە اعادەی حەرەکەی عین‌الفعل وە سکونی لام‌الفعل.

ئەصڵە کەیان تَمُدُّ بو (ت)تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، و ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە سکون جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلە کەیا: وە هاتین بۆ چاری ئەوە یا ادغامە کەمان هێشتەوە، وە لام‌الفعلە کەمان متحرک کرد بە یەکی لە حرەکاتی ثلاثە کسرە لەسەر قاعدەی مشهور وە فەتحەی لەبەر تخفیف، وە ضمە لەبەر مناسبەی حەرەکەی عین‌الفعلە کەی وە یا خود فەککی ادغامە کەمان کردەوە، وە حەرەکەی عین‌الفعلە کەمان اعادە کردەوە، وە جەلبی هەمزەی وەصڵی مضمومەمان کرد بۆ دەفعی ابتدا بە ساکن، گەڕا بە أُمْدُدْ «وَ تَقُولُ» تۆ

## مٰادّانِ مٰادّونَ مٰادَّةٌ مٰادَّتانِ و مادّات

ئەڵبێت لە دروست کردنی اسمی فاعل لە ثلاثی مجردی مضاعفا «مٰادٌّ»بۆ مفردی مذکر لە غائب وە مخاطب وە متکلمی وحدەدا، ئەصڵەکەی مادِدٌ بوو اجتماعی مثلین بوو، حەذفی حەرەکەی مثلی ئەوەڵمان کرد، وە دەغممان کرد لە مثلی ثانیدا گەڕا بە مادٌّ.

«مٰادّانِ» بۆ تثنیەی مذکر لە حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵەکەی مادٌّ بوو، ئەلف (أ) و نون (ن) عەلامەتی تثنیە بون ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلەکەمان مفتوح کرد، وە حەذفی تنوینەکەمان کرد لە بەر التقاءالساکنین گەڕا بە مادّان.

«مٰادّونَ» بۆ جەمعی مذکر لە حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵەکەی مادٌّ بوو، واو (ن) و نون (ن) کە عەلامەتی جمعی مذکر بون ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە حەذفی تنوینەکەمان کرد، لە بەر التقاءالساکنین گەڕا بە مادّون.

«مٰادَّةٌ» بۆ مفردی مؤنث ئەصڵەکەی مادٌّ بوو (ت) تێ و تنوین عەلامەتی مفردەدی مؤنث بوون ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، وە (ت) تێی تأنیث باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە مادّةٌ.

«مٰادَّتانِ» بۆ تثنیەی مؤنث لە حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵەکەی مادّة بو، ئەلف و نون عەلامەتی تثینە بون لە حاڵەتی رفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە، ئەلف موجبی فەتحەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مفتوح کرد گەڕا بە مٰادَّتانِ.

# مَوَادٌّ وَ تَقُولُ مَمْدُودٌ كَمَنْصُورٍ

«و مادّات» بۆ جمعی مؤنث سالم ئەصڵەکەی مادة بو الف و تیٚ عەلامەتی جمعی مؤنث سالم بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە. جا تیٚ مفردەکەمان حەذف کرد لەبەر گردبونەوە دو عەلامەتی تأنیث گەڕا بە مادات‌ٌ

«مَوَادٌّ» بۆ جەمعی مؤنثی مکسر ئەصڵەکەی مادّة بوو، هاتین بە ئەلفیٚ صیغەی مفاعل لەپاش ئەلفی اسمە فاعلەکەوە، جا التقاءالساکنین ڕوی‌دا لە بەینی هەردو ئەلفەکاندا، جا لە بەر دەفعی التقاءالساکنین قەلبی ئەلفی اسمەکەمان کرد بە واو.وە لەبەر ئەوە کە ئەم صیغە خاص بو بە مؤنثەوە، وەکو حوائض وە طوالق حەذفی تیٚی مفردەکەمان کرد گەڕا بە موادّ.

«وَ تَقُولُ مَمْدُودٌ كَمَنْصُورٍ» وە تۆ ئەڵێیٚ لە بینای اسمی مفعول بۆ ثلاثی مجرەدی مضاعف لە بابی ئەوەڵ دا ممدود وەکو اسمی مفعولی غیرە مضاعف وەکو منصور، یانی لە اسمی مفعولی مضاعفا مەجالی دەغم نیە لە بەر ئەوەکە واوی صیغەی اسمی مفعولەکە بوە بە فاصلە لە بەینی دو حەرفە مکسورەکەدا.

وە ئەمما اسمی فاعل وە اسمی مفعولی مزید فیە ئەوە وەکو فعلە مضارعەکەیان وانە، لە هەر شوێنیٚ کا دەغم لە فعلە مضارعەکەیانا ببیٚ، دەغم لە وانیشا ئەکریٚ، وەکو: ـ مُحْمَرٌّ وە مُحْمَارٌّ لە یحمّر وە یحمارّ وە مقشعرّ لە یقشعر وە مطمئن لە یطمأن مادام لە مضارعەکەیانا دەغم کراوە لەوانیشا دەغم ئەکریٚ..

## فَصْلٌ فِي الْمُعْتَلِّ

وَ هُوَ مٰا كٰانَ أَحَدُ أُصُولِهِ حَرْفَ عِلَّةٍ وَ هِيَ الْواوُ وَالْـيٰاءُ والأَلِـفُ وَ تُسَمّٰى حُرُوفَ الْمَدِّ وَاللِّينِ وَالأَلِفُ تَكُونُ حِينَئِذٍ مُنْقَلِبَةً عَنْ وٰاوٍ أَوْ يٰاءٍ

---

ئەمە فەصڵێکە باس لەو لەفظانە ئەکات کە لە عورفا پێیان ئەڵێن معتل.«وَ هُوَ مٰا كٰانَ أَحَدُ أُصُولِهِ حَرْفَ عِلَّةٍ» معتل بە لفظێ ئەڵێن کە یەکێ لە حروفی ئەصڵیەکانیان علله بێ «وَ هِيَ الْواوُ وَالْيٰاءُ والأَلِفُ» وە حەرفی علله واوە (و) و ییێە (ی) و ئەلفە (أ) «وَ تُسَمّٰى حُرُوفَ الْمَدِّ وَاللِّينِ» وە ئەم حەرفانە وەکو ناو ئەبرێن بە حەرفی علله ناویش ئەبرێن بە حروفی مدّ وە بە حروفی لین. وە بەم ئیعتبارە حروفی علله و مدّولین یەکێکن.

وە بازێ کەس فەرقیان ئەخا وە ئەڵێ: ئەم سێ حەرفە مطلقا متحرک بن یا ساکن، ناو ئەبرێن بە حەرفی علله.وە ئەگەر ساکن بن ئەوە ناو ئەبرێن بە حەرفی لین مطلقا چە ماقبلە کەیان متحرک بێ بە حەرە کەی مناسب بۆیان، واتە: ماقبلی ئەلف مفتوح بێ، وە ماقبلی واو مضموم بی، وە ماقبلی یێ مکسوربێ، یانە.وە ئەگەر ساکن بن وە ماقبلە کەیان متحرک بێ بە حەرە کەی مناسبە ئەوە ناو ئەبرێن بە حروفی مدّ، وەکو: قال، یقول، قیل.

«وَالأَلِفُ تَكُونُ حِينَئِذٍ مُنْقَلِبَةً عَنْ وٰاوٍ أَوْ يٰاءٍ» وە ئەلف کە یەکێکە لەم سێ حەرفە هەرگیز لە ثلاثیدا ئەصڵی نابێ بەڵکو منقلب ئەبێ لە واو یایێ، ئیستە ئەلفی قال ئەصڵە کەی واو بوە، وە ئـەلفی بـاع ئـەصڵە کـەی ییێە.

«وَ أَنْواعُهُ سَبْعَةٌ»

## اَلأَوَّلُ: اَلْمُعْتَلُّ الْفاءُ

**اَلنَّوْعُ الأَوَّلُ الْمُعَتَلُّ الْفاءُ وَ يُقالُ لَهُ الْمِثالُ لِمُما ثَلَتِهِ الصَّحِيحَ فِي احْتِمالِ الْحَرَكاتِ وَالسَّكَناتِ**

---

بە لام واو وە ییَ وا ئەبیَ ئەصلی بن، وەکو: واو یقول وە ییَ ی یبیع، وە وایش ئەبیَ منقلب ئەبن لە یەکەوە ییَ ی (سیّد) کە منقلبە لە واو ئەصلە کەی (سیود) بوە.

«وَ أَنْواعُهُ سَبْعَةٌ» ئەنواعی معتل حەوتن، چونکە حەرفی علله لەو لفظا ئەگەر یەکیَ بیَ ئەوە یا: ـ فاءالفعله یا عین‌الفعله وە یا لام‌الفعله، وە ئەگەر زیاترە لە یەکی ئەوە یا: ـ فاءالفعل و عین‌الفعله، وە یا فاءالفعل و لام‌الفعله، وە یا عین‌الفعل و لام‌الفعله، وە یا فاءالفعل و عین‌الفعل و لام‌الفعله.وە هەرکام لەم ئیحتمالاتە نەوعیَکن لە معتل وە ژمارەیان حەوتە.

«اَلنَّوْعُ الأَوَّلُ الْمُعَتَلُّ الْفاءُ» نەوعی ئەوەڵ لەو حەوت نەوعەی معتل، معتل الفایە: یانی فعلیَک وە یا اسمیَکی وایە کە فاءالفعلە کەی حەرفی عللە بیَ.«وَ يُقالُ لَهُ الْمِثالُ» وە ئەم نەوعە وەکو پیَ ی ئەوتریَ معتل الفاء، پیَشی ئە وتریَ: مثال.

«لِمُما ثَلَتِهِ الصَّحِيحَ فِي احْتِمالِ الْحَرَكاتِ وَالسَّكَناتِ» لە بەر ئەوە معتل الفاء بە ویَنەی فعل و اسمی صحیح وایە لە هەڵگرتن وقەبوڵ کردنی فاءالفعلەکەی بۆ حەرەکە مثلاً ئەڵییَت: ـ وَعَدَ وَعْداً وەکو: ضَرَبَ ضَرْباً.جا

أَمَّا الْوَاوُ فَتُحْذَفُ مِنَ الْمُضَارِعِ الَّذِي يَكُونُ عَلَى يَفْعِلِ بِكَسْرِالْعَيْنِ وَ مِنْ مَصْدَرِهِ الَّذِي يَكُونُ عَلَى فِعْلَةٍ وَ تُسْلَمُ فِي سَائِرِ تَصَارِيفِهِ تَقُولُ وَعَدَ يَعِدُ عِدَةً

---

بزانه ئەلف لە بەر ئەوە دائماً ساكنە قەت نابێ بە فاءالفعل وە فاءالفعل ئەم نەوعە يا واوە يا يێیە، جا با ئەحكامی هەر دوكيان بەيان بكەين: «أَمَّا الْوَاوُ فَتُحْذَفُ مِنَ الْمُضَارِعِ الَّذِي يَكُونُ عَلَى يَفْعِلِ بِكَسْرِالْعَيْنِ» جا ئەو فاءالفعلە كە واوە، ئەوە حەذف ئەكرێ لە فعلە مضارعێ لە سەر وەزنی يَفْعِلُ بێ بە كسرەی عين‌الفعل «وَ مِنْ مَصْدَرِهِ الَّذِي يَكُونُ عَلَى فِعْلَةٍ» وە هەم حەذف ئەكرێ لە مصدەرێكی وەهای كە لەسەر وەزنی فِعْلَةٍ بێ بە كسرەی فاءالفعل وە سكونی عين‌الفعل «وَ تُسْلَمُ فِي سَائِرِ تَصَارِيفِهِ» وە وەک خۆی ئە مێنێتە وە لە باقی مشتقاتەكە يا، وەكو: فعلی ماضی و اسمی فاعل وە اسمی مفعول وە غەيری ئە وانە..

«تَقُولُ» تۆ ئەلێيت: ـ لە مثالی معتل الفائيک‌دا كە مضارعە كەی لە سەر وەزنی يَفْعِلُ بێ بە كسرەی عين‌الفعل، وە مصدەرە كەی لەسەر وەزنی فِعْلَةٍ بێ هاتبێ بە كسرەی فاءالفعل، وە واويان تێدا حەذف بكرێ: ـ

«وَعَدَ» بۆ فعلی ماضی بە اثباتی واوە كەی «يَعِدُ» بۆ مضارعە كەی بە حەذفی واو، ئەصڵە كەی يَوْعِدُ بوو واوە كەی واقع بوو لە بەينی يێ حەرفی مضارع وە كسرەی عين‌الفعل دا، لە بەر ثقالەت حەذف كرا گەڕا بـە يَـعِدُ لەسەر وەزنی يَعِلُ، چونكی مادام لە مە وزونا حەذفی فاءالفعلە كە كراوە لە ميزانە كەيشا ئەكرێ.

**وَ وَعْداً فَهُوَ واعِدٌ وَ ذاکَ مَوْعُودٌ وَعِدْ وَ لاٰتَعِدْ وَ کَذٰلِکَ: وَمِقَ، یَمِقُ، مِقَةً فَإِذٰا أُزِیلَتْ کَسْرَةُ مٰا بَعْدَهٰا اُعِیدَتْ الواوُ الْمَحْذُوفَةُ**

---

«عِدَةً» بۆ مصدره کەی کە لە سەر وەزنی فِعْلَة بێ ئەصڵەکەی وِعْداً بوو بە کسرەی فاءالفعل وە سکونی عین‌الفعل حەذفی واوە کەمان کرد لە پاش نقڵی کسرە کەی بۆلای مابعد کەی، وە لە باتی ئەو واوە هاتین بە تێ و تنوین لە ئاخرە وە گەڕا بە عِدَةً لە سەر وەزنی عِلَةً.

«وَ وَعْداً» بۆ ئەو مصدەرەی لە سەر وەزنی فِعْلٌ بێ بە فتحەی فاءالفعل وە واوە کەی بمێنێتەوە.

«فَهُوَ واعِدٌ» بۆ اسمی فاعل بە اثبات واو «وَ ذاکَ مَوْعُودٌ» بۆ اسمی مفعول بە اثباتی واو.

«وَعِدْ» بۆ ئەمری بە صیغە بە حەذفی واو، ئەصڵە کەی تَعِدُ بۆ تێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی حە رە کە گەڕا بە عِدْ.

«وَ لاٰتَعِدْ» بۆ نەهی لە مفردی مذکری مخاطب بە حەذفی واو.«وَ کَذٰلِکَ: وَمِقَ، یَمِقُ، مِقَةً» وەکو: وعد، یعد، عدة ـ وایە لە اثبات و حەذفی واوا مادەی (ومق) وە باقی مادە کانی معتل‌الفای (واوی) کە مضارعە کە یان لە سەر وەزنی یَفْعِلُ بێ بە کسرەی عین‌الفعل وە مصدەرە کەیان لە سەر وەزنی فِعْلَة بێ بە کسرەی فاءالفعل «فَإِذٰا أُزِیلَتْ کَسْرَةُ مٰا بَعْدَهٰا أُعِیدَتْ الواوُ الْـمَحْذُوفَةُ» هەر کاتێ کسرەی مابعدی حەرفە مضارعە کە

نَحْوُ لَمْ يُوعَدْ وَ يَثْبُتُ الْوٰاوُ فِي يَفْعَلُ بِالْفَتْحِ كَوَجِلَ يَوْجَلُ ايجَلْ قُلِبَتِ الْوٰاوُ يٰاءاً لِسُكونِهٰا وَانْكِسارِ مٰاقَبْلَهٰا فَإِنِ انْضُمَّ مٰاقَبْلَهٰا عٰادَتِ الْوٰاوُ تَقُولُ يٰا زَيْدُ ايجَلْ

---

لابرا، واوه محذوفه كه ئيعادهئه كريّته وه «نَحْوُ لَمْ يُوعَدْ» به صيغهى بنا مفعولى مفرهدى مذكرى غائب، ئهصلّه كهى يَعِدُ بوو، به بىّ واو بـه لاّم پاش ئه وه ئهو صيغه كرابه بنا مفعول بـه ضـمهى حـهرفى مضارع وه فهتحهى ماقبلى ئاخره كهى واوه محذوفه كه مان هاته وه.

«وَ يَثْبُتُ الْوٰاوُ فِي يَفْعَلُ بِالْفَتْحِ» ئه ميّنيّته وه فاءالفعلىّ واو بىّ له ههر مضارعيّک دا له سه روهزنى يَفْعَلُ بىّ بـه فـتحهى عينالفـعل «كَـوَجِلَ يَوْجَلُ» له بابى رابع دا وهكو عَلِمَ يَعْلَمُ، «ايجَلْ» بوّ ئـهمرى بـه صـيغهى مفردى مذكرى مخاطب لهم بابا ئهصلّه كهى اِوْجَلْ بو، وهكو: اِعْلَمْ به اثباتى واو به لاّم له بهر ئه وه واوه كه ساكن بو، وه ماقبله كهى مكسور بوو قلب كرا به يىّ و بوبه ايجَلْ.وهكو مصنف فهرموى: ـ«قُلِبَتِ الْوٰاوُ يٰاءاً لِسُكونِهٰا وَانْكِسارِ مٰاقَبْلَهٰا» واته: واوه كهى قهلب كرابه يىّ چونكى ساكن بوو، وه ماقبله كهى مكسور بو، وه هه رواوىّ وهابىّ قهلب ئهكرىّ به يـىّ.«فَإِنِ انْضُمَّ مٰاقَبْلَهٰا عٰادَتِ الْوٰاوُ» يانى مادان قهلب كردنى واو به يـىّ له بـهر سكونى خوّى وه كسرهى ماقبله كه يهتى له ههر وهختىّ كا ماقبلى ئهويىّ مضموم كرا واوه كهى ديّتهوه «تَقُولُ يٰا زَيْدُ ايجَلْ» ئهصلّه كهى أوجل بو واو ساكن ماقبل مكسور قه لبمان كرد به يىّ به قاعدهى پـيّشو، وه كـاتى يازيد به ضمهى دالى زهيده كه، كهوته پيّشه وه، وه دالى زيد مضموم بوو،

**تُلَفَظُ بِالْوٰاوِ وَ تُكْتَبُ بِالْيٰاءِ وَ تَثْبُتُ فِي يَفْعُلُ بِـالضَمِّ كَـوَجُهَ يَـوْجُهُ أُوْجُهْ وَ لٰاتَوْجُهْ وَ حُذِفَتِ الْوٰاوُ مِنْ يَطَأُ و يَضَعُ وَ يَقَعُ وَ يَدَعُ لِأَنَّهٰا فِي الأَصْلِ عَلٰى يَفْعِلُ بِالْكَسْرِ فَفُتِحَ عَيْنُهٰا لِحَرْفِ الْحَلْقِ**

---

وە همزە وەصڵە کە لە ناودا ڕۆیشت ماقبلی یێ کە مضموم بوو، وە یێ کە مان کرد بە واو ـ بـە لاّم «تُلَفِّظُ بِالْوٰاوِ وَ تُكْتَبُ بِالْيٰاءِ» ئـەمما ئـەم واوە تلفظی پێ ئەکرێ بە واو وە ئە نوسرێ بە یێ، لە بەر ئـەوە کـە دستوری نوسین وایە کە ئە وەڵی کلمە بنوسرێ بە تقدیری ابتدا پێ کردنی، یانی بە حسیبی ئە وە هیچی لە پێشەوە نە بێ، وە ئاخرە کەی بنوسرێ بە حسیبی ئە وە کە وەقفەی لە سەر بکرێ .

«وَ تَثْبُتُ فِي يَفْعُلُ بِالضَمِّ كَوَجُهَ يَوْجُهُ أُوْجُـهْ وَ لٰاتَـوْجُهْ» وە واو ئەمێنێتە وە لە کاتێک دا فاءالفعل بێ لە يَفْعُلْ بە ضمەی عین‌الفعل، وەکو: واوی وَجُهَ يَوْجُهَ لە بابی سادس لە صیغەی ماضی و مضارع و ئەمرونەهیا، لە بە ر ئەوە کە مابعدی واوە کە مکسور نیە جالە بە ر ئەوە پرسیار کرا مادام واوی فاءالفعل ئە مێنێتە وە لە یفعل بە فـتحەی عـین‌الفـعل، دەی بـۆچی حـەذف کـراوە لە یَـطَأُ و یَـضَعُ و یَـقَعُ و یَـدَعُ مـع انـە ئـە مـانە مفتوح العینن؟مصنف فەرموی: «وَ حُذِفَتِ الْوٰاوُ مِنْ يَطَأُ و يَضَعُ وَ يَقَعُ وَ يَدَعُ لِأَنَّهٰا فِي الأَصْلِ عَلٰى يَفْعِلُ بِالْكَسْرِ» واتە حەذف کراوە واو فاءالفعل لەم صیغانا چونکی ئە مانە لە ئەصلاً لە سەر وەزنی يَفْعِلْ بـوون بـە کسـرەی عین‌الفعل، وە حەذفی واوە کە یان کراوە لە سەر قاعدەی دامە زراو، «فَفُتِحَ عَيْنُهٰا لِحَرْفِ الْحَلْقِ» وە پاش حەذفی واوە کە یان عین‌الفعلە کە یان مفتوح

**وَ حُذِفَتْ مِنْ يَذَرُ لِكَوْنَهٰا فِي مَعْنٰى يَدَعُ وَ أَمٰاتُوا مٰاضِيَ يَدَعُ وَ يَذْرِعُ وَ حَذْفُ الْفٰاءِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْمَحْذُوفة وٰاوٌ**

كراوه له بەر مقابلەی قورسی حەرفە حەلقە كە.جا مادام وابیّ حەذفی واوە كە له مانا لە سەر قاعدەیە و مقبولّه.

ئەم جار لە بەر ئەوە كە رەخنە هاتەوە سەر مصنف بە حەذفی واوی (يذر) كە ئەصلّە كەی (يِوْذَرُ) بوە مع أنه مفتوح العينه، وە عينالفعل وە لامالفعلی حەرفی حەلق نین، مصنف جوابی ئە و رەخنەیەی دايە وە، وە فەرموی: ـ«وَ حُذِفَتْ مِنْ يَذَرُ لِكَوْنَهٰا فِي مَعْنٰى يَدَعُ» یانی حەذفی واوی فاءالفعل كراوە لە يَذَرُ لە بەر ئەوە كە بە مەعنای يَدَعُ ئیستعمال ئەكریّ، وە بە حەمل لە سەر ئە وە لە بەر موافقەی فیالمعنی.«وَ أَمٰاتُوا مٰاضِيَ يَدَعُ وَ يَذْرُ» عە رەبە كان تەركی ئیستعمالی فعلی ماضیان كرد وە لە بۆ (يَذَرُ وَ يَدَعُ) وە لە باتی ئەوان لفظی (تَرَكَ) یان بە كار هێناوە.

وە بزانن ئەم باسە لە گەڵ ئە واكە بەیانی واقعە ئیحتمالی هەیە تأید بیّ بۆ جوابی رە خنە كەیش واتە: بێجگە لە وە كە ئەم دو مضارعە حەمل كراون لە سەر يدع لە عینی كاتا لە بەر قورسی لفظە كە یشیانە بە نەوعیّ كە ماضیيە كەیان لە بەر قورسی بالمرة تەرک كراوە، وە ئیستعمال ناكریّ كە وابیّ موناسبی تخفیفن بە حەذفی واوی فاءالفعلە كە یان: جالە بەر ئە وە كەسیّ پرسیاری كرد، مادام فعلی ماضی ئەمانە تەرک كراوە

وە فاءالفعلی مضارعە كەیشیان محذوفە، دەلیل چیيە كە محذوف لەو فعلانە دا واوە؟مصنف لە جوابیا فەرموی: «وَ حَذْفُ الْفٰاءِ دَلِيلٌ عَلَى أَنَّ الْمَحْذُوفة وٰاوٌ» یانی حەذفی فاءالفعل لەم فعلانەدا دەلیلە لە سەر ئەوە كە

وَ أَمَّا الْيٰاءُ فَتَثْبُتُ عَلَى كُلِّ حٰالٍ نَحْوُ يَمُنُ، يَيْمُنُ و يَسَرَ، يَيْسِرُ و يَئِسَ، يَيْئَسُ وَ تَقُولُ فِي أَفْعَلَ مِنَ الْيٰائِيِّ أَيْسَرَ وَ يُوسِرُ وَ لَمْ يُحْذَفْ لأَنَّ حَذْفَ الْوٰاوِ مَعَ الْهَمْزَةِ اِجْحٰافٌ فَهُوَ مُوسِرٌ وَ فِي اِفْتَعَلَ مِنْهُمٰا اِتَّعَدَ

---

ئەوەی حەذف کراوە واوە، یێ نیە.چونکی یی لە مضارعی مثالا حـەذف ناکرێ وەکو ئیستە بە یان ئەکرێ، جا لە کاتێک دا بـاسی واو تـەواو بـو، دەستی کرد بە باسیی یێ (ی) و فەرموی: «وَ أَمَّا الْيٰاءُ فَتَثْبُتُ عَلَى كُلِّ حٰالٍ» یانی ئە مما فاءالفعلی کـە یـێ بـێ ئـەوە ئـە مـێنێتە وە لە هـە موو حاڵەتێک‌دا، واتە لە فعلی ماضی یا مضارع‌دا، وە لە مصدر و اسمی فاعل و اسمی مفعول‌دا، وە لە کاتێک دا مضارع مضموم‌العین یا مکسورالعـین یـا مفتوح‌العین بێ.«نَحْوُ يَمُنُ، يَيْمُنُ» لە بابی سادس «و يَسَرَ، يَـيْسِرُ» لە بابی ثانی «و يَئِسَ، يَيْئَسُ» لە بابی رابع دا «وَ تَقُولُ فِي أَفْعَلَ مِنَ الْيٰائِيِّ» تۆ ئە ڵێیت لە بنای بابی افعال لە معتل الفای یائی دا «أَيْسَـرَ» بـۆ فـعلی ماضی مفرد مذکری غائب لە معتل‌الفای یائی دا بە اثبـاتی یـێ کـەی «وَ يُوسِرُ» بۆ مضارعە کەی بە قەلبی یێ بە واو، چونکی قاعدەیە کە: یـێ‌ی ساکن ماقبل مضموم قەلب ئە کرێ بە واو.

«وَ لَمْ يُحْذَفْ لأَنَّ حَذْفَ الْوٰاوِ مَعَ الْهَمْزَةِ اِجْحٰافٌ» ئـیتر حـەزفی واوە کەش لە گەڵ حەذفی همزە کە یا ستمە و نامناسبە «فَهُوَ مُوسِرٌ» وە لە بۆ اسمی فاعلی بابی افعال ئە ڵێیت: ـ مُوسِرٌ، «وَ فِي اِفْتَعَلَ مِنْهُمٰا» وە تۆ ئەڵێیت: لە دروست کردنی بابی افتعال لە مثالی واوی‌دا و یائی‌دا «اِتَّعَدَ» بۆ واوی، ئەصڵە کەی أِوْتَعَدَ بوە قە لبی واوە کەمان کرد بە تێ، وە تیمان لە تێ‌دا دەغم کرد گەڕا بە اِتَّعِد «يتَّعِدُ» بۆ مضارعە کەی ئەصڵە کەی يَوْتَعِدُ

يَتَّعِدُ فَهُوَ مُتَّعِدُ وَ اِتَّسَرَ يَتَّسِرُ فَهُوَ مُتَّسِرُ وَ يُقَالُ اِيتَعَدَ يَاتَعِدُ، فَهُوَ مُوتَعِدُ وَاِيتَسَرَ يَاتَسِرُ فَهُوَ مُوتَسِرُ و موتسر فيه

---

بوو، قەلبی واو مان کرد بە تێ وە تێمان لە تێدا دەغم کرد گەڕا بە یَتَّعِدُ. «فَهُوَ مُتَّعِدُ» بۆ اسمی فاعل ئەصڵەکەی مَوْتَعِدُ بوو، قەلبی واومان کرد بە تێ، وە تیمان لە تی دا دەغم کرد گەڕا بە مُتَّعِدُ.«وَ اِتَّسَرَ» عەطفە لە سەر قەولی مصنف کە فەرموی: ـ اِتَّعدَ.ئە صڵە کەی ایتسر قەلبی یێمان کرد بە تێ، وە تێمان دەغم کرد لە تێدا گەڕا بە اِتَّسَرَ، «یَتَّسِرُ» بۆ مضارعە کەی ئەصڵە کەی یَیْتَسِرُ بوو، قەلبی یێ مان کرد بە تێ وە تیمان لە تێدا دەغم کرد گەڕا بە یَتَّسِرُ.

«فَهُوَ مُتَّسِرُ» بۆ اسمی فاعل ئەصڵەکەی مُیْتَسِرُ بوو قەلبی یێ مان کرد بە تێ، وە تێمان لە تێدا دەغم کرد گەڕا بە مُتَّسِرُ «وَ یُقَالُ اِیتَعَدَ یَاتَعِدُ، فَهُوَ مُوتَعِدُ» ئەوترێ لە بابی افتعالی واوی دالە مادەی وعد «ایتعد» لە ماضیدا ئەصڵە کەی اِوْتَعد بوو، قەلبی واومان کرد بە یێ گەڕا بە ایتعَدَ وە «یاتعد» بۆ مضارعە کەی ئەصڵە کەی یَوْتَعِدُ بو قەلبی واومان کرد بە ئەلف.گەڕا بە یاتعد وە «مُوتَعِد» بۆ اسمی فاعل بە هێشتنە وەی واوە کەی.«وَاِیتَسَرَ یَاتَسِرُ فَهُوَ مُوتَسِرُ» وە ئەوترێ لە بنای بابی افتعال لە مثالی یائی لە مادەی یَسَر، «ایتسر» بۆ ماضی بە هێشتنە وەی یێ کەی.وە «یاتسر» بۆ مضارعە کەی بە قەلبی یێ کەی بە ئەلف.«و موتسر فیه» بۆ اسمی فاعل و مفعول بە قەلبی یی کەی بە واو.. وە لفظی (فیه) بۆ اشارەیە بۆلای ئەوەکە اسمی مفعول لە فعلی لازم دروست ناکرێ بە بێ واسطەی حەرفی جەر، وەکو لە

## وَ حُكْمُ وَدَّ يُوَدُّ كَحُكْمِ عَضَّ يَعَضُّ والأمر: ايدَدْ كَاِعْضَضْ

باسی اسمی مفعول‌دا ڕابورد«وَ حُكْمُ وَدَّ يَوَدُّ كَحُكْمِ عَضَّ يَعَضُّ» یانی حوکمی بابی رابع لە مضاعفی معتل‌الفا دا وەکو حوکمی بابی رابعە لە مضاعفی غیره معتل‌الفا دا لە: وجوب وە امتناع وە جوازی ادغام وە باقی ئەحواڵ دا «والأمر: ايدَدْ كَاِعْضَضْ» وە دروستە فەککی ادغام بکە یتەوە لە صیغەی ئەمری مضاعفی معتل‌الفادا، وەکو: ایدد لە وێنەی اعضض مشتقە لە تَوَدُّ، تێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، و ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە سکون، جا لە بەر ئەوە ئیلتقاءالساکنین پەیدا بوو لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلە کە یا، حە رەکەی عین‌الفعلە کە مان وەر گرتە وە لە فاءالفعلە کەی، وە همزەی وەصڵی مکسورە مان هێنا بۆ دەفعی ابتدا بە ساکن گەڕا بە (اودد) جا واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە أیدد وەکو اِعْلَمْ.

# اَلثّانى: اَلْمُعْتَلُّ الْعَيْنُ

وَ يُقْالُ لَهُ الأَجْوَفُ وَ ذُوالثَّلاثَةِ لِكَوْنِ مٰاضِيهِ عَلَى ثَلاثَهِ أَحُـرفٍ اِذٰا أَخْبَرْتَ عَنْ نَفْسِكِ فَالثُّلاثِيُّ الْمُجَرَّدُ تُقْلَبُ عَيْنُهُ فِى الْمٰاضِى اَلِفاً، وٰاواً كٰانَ أَوْ يٰاءً لِتَحَرُّكِهِمٰا وَانْفِتٰاحِ مٰاقَبْلَهُمٰا

---

نەوعی دوهەم لەو حەوت نەوعەی معتل: ئەوەیە کە معتل‌العـین بـێ یانی فعلێکە یا اسمێکە کە عین‌الفعلە کەی حەرفی عللە بێ.«وَ يُقْالُ لَـهُ الأَجْوَفُ» وە بەم نەوعە معتلە ئەوترێ: (أجوف) یانی قرۆڵ بەو مناسبە وە کە عین‌الفعلە کەی لە بەر ئەوە کە حەرفی عللە یە وەکو نەبووایە، وە ناوە ڕاستە کەی پوچە «وَ ذُوالثَّلاثَةِ» هەم پێشی ئەوترێ ذو ثلاثە یانی خاوەن سێ حەرف «لِكَوْنِ مٰاضِيهِ عَلَى ثَلاثَهِ أَحُرفٍ اِذٰا أَخْبَرْتَ عَنْ نَفْسِكَ» چونکی ماضی‌یەکەی دێتە سەر سێ حەرف لەوکاتاناکە صیغەی متکلمی لێ دروست بکرێت، وەکو قُلْتُ و بِعْتُ، چونکە مادام عـین‌الفـعلە کـەی حەذف ئەکرێ وە ضمیری متکلم لە بە رئە وە کە فاعلە وە زۆر تێکەڵە لە گەڵ فعلە کە دا وەکو حـەرفێ وایـە لەو فـعلە سـێ حـەرفە، ئـەمێنێتە وە فاءالفعل وە لام‌الفعل وە ضمیرە کە: ـ

«فَالثُّلاثِيُّ الْمُجَرَّدُ تُقْلَبُ عَيْنُهُ فِى الْمٰاضِى اَلِفاً، وٰاواً كٰانَ أَوْ يٰـاءً لِتَحَرُّكِهِمٰا وَانْفِتٰاحِ مٰاقَبْلَهُمٰا» واتە: ثلاثی مجرد لە معتل‌العین دا قـەلبی عین‌الفعلی ئەکرێ بە ئەلف لە کاتێک‌دا متحرک بێ، وە ماقبلە کەیان مفتوح

**نحو صٰان و بٰاعَ فَاِنِ اتَّصَلَ بِهِ ضَمِيرُ الْمُتَكَلِّمِ أَوِالْمُخاطَبِ أَوْ جَمْعُ الْمُؤَنَّثِ الْغٰائِبَةِ نُقِلَ فَعَلَ مِنَ الْوٰاوِيِّ اِلَى فَعُلَ وَ مِنَ الْيٰائِيِّ اِلَى فَعِلَ دَلالَةً عَلَيْهِمٰا وَ لَمْ يُغَيَّر فَعُلَ وَ لافَعِلَ اِذٰا كٰانٰا أَصْلِيَيْنِ**

---

بێ «نحو صٰان و بٰاعَ» وەکو صان لە واوی‌دا وە باع لە یائی‌دا، ئەصڵە کەیان صَوَنَ و بَيَعَ بوو، واو وە یێ متحرک وە ماقبلەکەیان مفتوح بو قەلبمان کردن بە ئەلف گەڕان بە صٰانَ و بٰاعَ.

«فَاِنِ اتَّصَلَ بِهِ ضَمِيرُ الْمُتَكَلِّمِ أَوِالْمُخاطَبِ أَوْ جَمْعُ الْمُؤَنَّثِ الْغٰائِبَةِ» جا ئەگەر لکابە و فعلە ثلاثی‌یە معتل‌العینە وە ضمیری متکلمی یا مخاطب یا جەمعی مؤنثی غائب، ئەو ضمیرە کە مشهورە بە ضمیری مرفوعی متحرک «نُقِلَ فَعَلَ مِنَ الْوٰاوِيِّ اِلَى فَعُلَ وَ مِنَ الْيٰائِيِّ اِلَى فَعِلَ» لەو کاتا نقڵی فعل مفتوح‌العین ئەکرێ ئەگەر عین‌الفعلە کەی واوی بێ بۆلای فَعُلَ بە ضمەی عین‌الفعل، وە نەقڵی فَعَلَی مفتوح‌العین ئەکرێ ئەگەر عین‌الفعلە کەی یێ بێ بۆلای فَعِلَ بە کسرەی عین‌الفعل «دَلالَةً عَلَيْهِمٰا» بۆ ئەوە کە ئەو ضمەی عین‌الفعلە نقڵ بکرێ بۆلای فاءالفعلە کەی، وە دەلاڵەت بکا لە سەر واوە عین‌الفعلە کە لە پاش حەذفی، وە ئەو کسرەی عین‌الفعلە نقڵ بکرێ بۆلای فاءالفعلە کەی، وە دەلاڵەت بکا لە سەر یێ‌ی عین‌الفعلە کە لە پاش حەذف کردنی..

«وَ لَمْ يُغَيَّر فَعُلَ وَ لافَعِلَ اِذٰا كٰانٰا أَصْلِيَيْنِ» بەڵام فعل بە ضمەی عین‌الفعل وە فِعل بە کسرەی عین‌الفعل ناگۆڕێ وەلە شوێنی خویانا ئەهێڵرێنەوە، هەر کاتێ ئەو ضمە و کسرە ئەصڵی بن، بەم ڕەنگە

ثُمَّ نُقِلَتِ الْكَسْرَةُ وَالضَّمَةُ اِلَى الْفَاءِ وَ حُذِفَتِ الْعَيْنُ لِإِلْتِقَاءِ الْساكِنَيْنِ فَتَقُولُ صٰانَ صٰانٰا صٰانُوا صٰانَتْ

---

مضمومالعين له بابی سادس، وه مكسورالعين له بابی رابع يا خامس بـێ «ثُمَّ نُقِلَتِ الْكَسْرَةُ وَالضَّمَةُ اِلَى الْفَاءِ» جا نقل ئەكرێ ضمه و كسرەی عينالفعل چه به نقل پەيدا بوبن يا هەر ئەصڵی بن بۆلای فاءالفعله كان «وَ حُذِفَتِ الْعَيْنُ لِإِلْتِقَاءِ الْساكِنَيِنِ» وه لەپاش نەقڵی ضمه و كسره كـه يـان حەذفی خۆيان ئەكرێ لەبەر التقاءالساكنين له بەينی ئەو عينالفعلا كه به ساكنی ماوەتەوه، وه له بەينی لامالفعله كه داكه به هۆی ضميره كـانه وه ساكن كراوه.«فَتَقُولُ» جا تۆ ئەڵێیت له مثالی معتلالعين له بابی ئەوەڵ دا كه عينالفعله كەی واو بێ.

«صٰانَ» بۆ مفردی مذكری غائب، ئەصڵه كەی صَوَنَ بوو، واو متحرك ماقبل مفتوح قەلبمان كرد به ئەلف، گەڕا به صٰانَ.

«صٰانٰا» بۆ تثنيەی مـذكری غـائب، ئـەصڵه كـەی صٰـانَ بـوو، ئـەلف ضميری فاعلی تثنيه بوو ئيلحاقمان كرد به ئاخريه وه، گەڕا به صانا.

«صٰانُوا» بـۆ جـەمعی مـذكری غـائب، ئـەصڵەكـەی صـان بـوو، واو ضميری فاعلی جەمعی مذكربوو ئيلحاقمان كـرد بـه ئـاخريه وه، جـا واو باعثی ضمەی ماقبلی بوو، ماقبله كه مان مضموم كردگەڕا به صٰانُوا.

«صٰانَتْ» بو مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵه كەی صٰانَ بوو، (ت) تیِّ ی ساكنه عەلامەتی مفرەدی مؤنثی غائب بو ئيلحقمان كرد به ئاخريه وەگەڕا به صٰانَتْ.

**صٰانَتٰا صُنَّ وَ کَذٰلِکَ صُنْتَ، صُنْتُمٰا، صُنْتُمْ، صُنْتِ، صُنْتُمٰا، صُنْتُنَّ، صُنْتُ، صُنّٰا وَ بٰاعَ**

«صٰانَتٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی صانت بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو لاحقمان کرد بە ئاخریە وە، وە ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کە مان مفتوح کرد گەڕا بە صانتا.

«صُنَّ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی بە ئیعتباری ئیعلالی معتل‌العین صَوَنَّ بوو بە فتحەی واو، جا ئەم صیغە مفتوح‌العینە مان نقڵ کرد بۆلای فَعُلَ بە ضمەی عین‌الفعل، وە ضمە کە لەسەر واو ثقیل بوو نقڵ‌مان کرد بۆلای فاءالفعلە کەی لە پاش حەذفی حەرە کە کەی خۆی، وە التقاءالساکنین پەیدا بوو لە بەینی ئەو ولام‌الفعلە کەدا، وە حەذفی واوە کە مان کرد، وە ئیکتفامان کرد بە دەلالەتی ضمەی فاءالفعلە کە لە سەر ئەو واوە محذوفە گەڕا بە صُنَّ «وَ کَذٰلِکَ صُنْتَ، صُنْتُمٰا، صُنْتُمْ، صُنْتِ، صُنْتُمٰا، صُنْتُنَّ، صُنْتُ، صُنّٰا» ئەصڵە کەیان صَوَنْتَ، صَوَنْتُمٰا، صَوَنْتُمْ، صَوَنْتِ، صَوَنْتُمٰا، صَوَنْتُنَّ، صَوَنْتُ، صَوَنّٰا وەکو: نَصَرْتَ، نَصْرتُمٰا تا ئاخر، وە بۆ ئیعلالی ئە مانە ئەڵێین: ـ نقڵی فَعَلی مفتوح‌العینی واویمان کرد بۆلای فَعُل بە ضمەی عین‌الفعل، وە نقل ضمەی عین‌الفعلە کە مان کرد بۆلای فاءالفعلە کەیان، لە پاش حەذفی حەرە کە کەی خۆی، جا حەذفی واوە کە مان لێ‌کردن لەبەر دەفعی التقاءالساکنین، وە ضمەی فاءالفعلە کە مان کرد بە دەلیل لە سەری گەڕان بە صُنْتَ، صُنْتُمٰا، .. تا ئاخر.

« وَ بٰاعَ» عەطفە لە سەر قەولی مصنف کە فەرموی: ـ «صان» باع بۆ أجوفی یائی لە بابی ثانی، ئەصڵە کەی بَیَعَ بوو یێ متحرک ماقبل مفتوح

بٰاعٰا بٰاعُوا بٰاعَتْ بٰاعَتٰا بِعْنَ و كذلک بِعْتَ، بِعْتُمٰا، بِعْتُمْ، بِعْتِ، بَعْتُمٰا، بِعْتُنَّ، بِعْتُ، بِعْنٰا

---

قلبمان کرد به ئەلف گەڕا به بٰاعَ.

«بٰاعٰا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی باع بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیه بو ئیلحاقمان کرد به ئاخریه وە، گەڕا به باعا.

«بٰاعُوا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی باع بوو، واو ضمیری جمعی مذکور بوو، ئیلحاقمان کرد پێیه وە، وە واو باعثی ضمەی ماقبلی بوو، ماقبله که مان مضموم کرد گەڕا به بٰاعُوا.

«بٰاعَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی باع بوو، تیٚ‌ی ساکنه عەلامەتی مفردی مؤنثی غائب بوو، ئیلحقمان کرد پێیه وە گەڕا به بٰاعَتْ.

«بٰاعَتٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی بٰاعَتْ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیه بوو، ئیلحاقمان کرد به ئاخریه وە، وە ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلمان مفتوح کرد گەڕا به بٰاعَتٰا.

«بِعْنَ» بۆ جمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی بَیَعْنَ بوو، وەکو: ضَرَبْنَ، نقڵمان کرد بۆلای بَیِعْنَ به کسرەی عین‌الفعل، جا کسره له سەر یێ ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆلای فاءالفعله کەی پاش حەذفی حەره کە کەی خۆی، جا حەذفی یێ که مان کرد لەبەر التقاءالساکنین له بەینی ئەو ولام‌الفعله کەیا، وە کسرەی فاءالفعله که مان کرد به دەلیل له سەر یێ محذوفه کە گەڕا به بِعْنَ «و کذلک بِعْتَ، بِعْتُمٰا، بِعْتُمْ، بِعْتِ، بَعْتُمٰا، بِعْتُنَّ، بِعْتُ، بِعْنٰا» ئەصڵیان: بَیَعْتَ، بَیَعْتُمٰا بوو تا ئاخر به فتحەی عین‌الفعل له هەموویانا، وە له

**وَ اِذٰا بَنَيْتَهُ لِلْمَفْعُولِ كَسَرْتَ الْفٰاءَ مِنَ الْجَمِيعِ فَقُلْتَ صِينَ وَاعْتِلالُهُ بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ وَ بِيعَ اِعْلالُهُ بِالنَّقْلِ**

هەموویانا ئەڵێن: نقلی فَعَل‌ی مفتوح‌العین مان کرد بۆلای فَعِلْ بە کسرەی عین‌الفعل، وە کسرە لەسەر یێ ثقیل بوو، نقلْمان کرد بۆلای فاءالفعلە کەی، پاش حەذفی حەرەکە کەی خۆی، وە حەذفی عین‌الفعلە کەمان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەو ولام‌الفعلە کەیا، وە کسرەی فاءالفعلە کەمان کرد بە دەلیل لە سەر یێ کە گەڕان بە بِعْتَ، بِعْتُمٰا، بِعْتُمْ، تا ئاخر.

«وَ اِذٰا بَنَيْتَهُ لِلْمَفْعُولِ كَسَرْتَ الْفٰاءَ مِنَ الْجَمِيعِ» کاتێ ثلاثی مجردی أجوف دروست بکەی بۆ صیغەی بنامفعول پێویستە فاءالفعل لە هەموو بابە کانا مکسور بکەی، خوای مفتوح‌العین بێ یا مکسورالعین یا مضموم‌العین «فَقُلْتَ صِينَ وَاعْتِلالُهُ بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ» جا لە سەر ئەو یاسا، ئەڵێت: صِينَ لە بنامفعولی ماضی بابی ئە وەڵ دا، ئەصڵە کەی صُوِنَ بوو، بە ضمەی فاءالفعل وە کسرەی عین‌الفعل، کسرە لە سەر واو ثقیل بوو، نقلْمان کرد بۆلای ماقبلە کەی پاش حەذفی حەرە کە کەی خۆی، جا واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە صِينَ ـ هۆی ئیعلال کردنی بە نقلْ وە قلب واتە: ـ نقلی حەرە کەی عین‌الفعلە کەی بۆلای ماقبلە کەی وە قەلبی بە یێ.

«وَ بِيعَ اِعْلالُهُ بِالنَّقْلِ» وە بۆ بنا مفعول بابی ثانی ئەڵێت: ـ بِيعَ بە ئیعلال بەگۆڕینی عین‌الفعلە کەی بە نقلی حەرە کە کەیەتی بۆلای فاءالفعلە کەی و بەس.

**وَ تَقُولُ فِي الْمُضَارِعِ يَصُونُ وَ يَبِيعُ وَاعْتِلَالُهُمَا بِالنَّقْلِ وَ يَخَافُ وَ يَهَابُ وَاعْلَالُهُمَا بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ**

ئەصڵی بِیعَ، بُیِع بوو بە ضمەی فاءالفعل وە کسرەی عینالفعل، جا کسرە لە سەر یێ ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆلای ماقبلەکەی گەڕا بە بِیعَ..

«**وَ تَقُولُ فِي الْمُضَارِعِ يَصُونُ وَ يَبِيعُ وَاعْتِلَالُهُمَا بِالنَّقْلِ**» تۆ ئەڵێیت لە دروست کردنی مضارعی ثلاثی مجردی معتلالعین یَصُونُ بۆ بابی ئەوەڵی واوی، و یَبِیعُ بۆ بابی ثانی یائی، وە ئیعلالەکەیان بە نقڵی حەرەکەی عینالفعلەکەیانە بۆلای فاءالفعلەکەیان، ئەصڵی یَصُونُ بە ضمەی صاد یَصْوُنُ بە سکونی صاد، وەکو یَنْصُرُ ضمە لە سەر واو ثقیل بوو نقڵمان کرد بولای ماقبلەکەی گەڕا بە یَصُونُ.

وە ئەصڵی یبِیعُ بە کسرەی بێ یَبْیِعُ بوو بە سکونی بێ، وەکو یَضْرِبُ، کسرە لە سەر یێ ثقیل بوو، نەقڵمان کرد بۆلای ماقبلەکەی گەڕا بە یَبِیعُ.

«**وَ يَخَافُ**» بۆ مضارعی ثلاثی مجردی ئەجوەفی بابی رابع واوی دا «**وَ يَهَابُ**» بۆ مضارعی ئەجوەفی بابی رابع لە یائی دا «**وَاعْلَالُهُمَا بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ**» وە ئیعلالی ئەمانە بە نقڵی حەرەکەی عینالفعلەکەیانە بۆلای ماقبلەکەی وە قلبی عینالفعلەکەیان بە ئەلف..

جا ئەصڵی یَخَافُ یَخْوَفُ بوو، وەکو: یَعْلَمُ نەقڵی حەرەکەی یێ کەمان کرد بۆلای ماقبلەکەی، وە قەلبمان کرد بە ئەلف لەسەر یاسای (واو الان ساکن وە لە ئەصڵا متحرک وە ماقبل مفتوح واجبە قەلب بکرێ بە ئەلف.)

وە ئەصڵی یهاب، یَهْیَبُ بووە و یَعْلَمُ نەقڵی حەرەکەی یێ مان کرد

**وَ يَدْخُلُ الْجٰازِمُ فَيَسْقُطُ الْعَيْنُ اَذٰا سَكَنَ مٰابَعْدَهُ وَ تَثْبُتُ إِذٰا تَحَرَّكَ تَقُولُ لَمْ يَصُنْ لَمْ يَصُونٰا لَمْ يَصُونُوا**

---

بۆلای ماقبلە کەی، وە قەلبمان کرد بە ئەلف لە سەر یاسای (یی الان ساکن وە لە ئەصلا متحرک وە ماقبل مفتوح واجبە قەلب بکرێ بە ئەلف.) وە گەڕا بە یَهٰابُ.

«وَ يَدْخُلُ الْجٰازِمُ فَيَسْقُطُ الْعَيْنُ اَذٰا سَكَنَ مٰابَعْدَهُ وَ تَثْبُتُ إِذٰا تَحَرَّكَ» یانی عاملی جازم داخڵ ئەبێتە سەر فعلی مضارعی معتل‌العین، وە لەم کاتا عین‌الفعلە کەی ئەڕوات لە بەر التقاءالساکنین کاتێ کە مابعدە کەی ساکن ببێ، وە ئە مێنێتە وە کاتێ کە مابعدە کەی متحرک بێ.«تَقُولُ لَمْ يَصُنْ» تۆ ئەڵێێت لە کاتی داخل بونی عاملی جازم لە سەر فعلی مضارعی ئەجوەف، لَمْ يَصُنْ ئەصڵە کەی يَصُونُ بوو، عاملی جازم داخڵ بویە سەری وە ئاخرە کەی مجزوم کرد بە سکون، جا عین‌الفعلە کەی حەذف کرا لەبەر التقاءالساکنین گەڕا بە لَمْ يَصُنْ «لَمْ يَصُونٰا» بۆ تثنیەی مذکری غائب ئەصڵە کەی يَصُونٰانِ بوو، عاملی جازمی داخل بوە سەر، وە ئاخرە کەی مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە لم یصونا بە مانە وەی عین‌الفعلە کەی لە بەر ئەوە کە مابعدە کەی متحرکە.

«لَمْ يَصُونُوا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی يَصُونُونَ بوو، عاملی جازمی داخل بوە سەر وە ئاخرە کەی مجزوم کرد بە حەزفی نون گەڕا بە لَمْ يَصُونُوا، بە مانە وەی عین‌الفعلە کەی لە بەر ئەوە کە مابعدە کەی متحرکە.

لَمْ تَصُنْ لَمْ يَصُنَّ لَمْ تَصُنْ لَمْ تَصُونٰا لَمْ تَصُونُوا لَمْ تَصُونِی لَمْ تَصُونٰا لَمْ تَصُنَّ لَمْ أَصُنْ وَلَمْ نَصُنْ وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ لَمْ يَبِعْ، لَمْ يَبِيعٰا، لَمْ يَبِيعُوا، الخ... لمْ يَخَفْ، لَمْ يَخٰافٰا، لَمْ يَخٰافُوا، الخ...

---

«لَمْ تَصُنْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب.«لَمْ تَصُونٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئیعلال ئەکرێن وەکو: مفرە دو تثنیەی مذکری غائب.

«لَمْ يَصُنَّ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵەکەی يَصُنَّ بوو، بە حەذفی عین الفعله كە لە بەر ڕودانی التقاءالساكنين لە بەینی عین‌الفعل و لام‌الفعله کە یدا، عاملی جازمی داخل بوە سەر، وە عەملی نەکرد لە بەر ئەوە کە ضمیری فاعلی جمعی مؤنث عمدەیە و قابلی حەذف نیە.عەلاوەی ئەوە فعلی جمعی مؤنث مبنی‌یە لە بەر اتصالی نونی جمع پێ‌یە وە مایە وە لَمْ يَصُنَّ.

«لَمْ تَصُنْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب.«لَمْ تَصُونٰا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب.«لَمْ تَصُونُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب.

«لَمْ تَصُونِی» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَصُونِينَ بوو، عاملی جازمی داخل بوە سەری حەذفی نونەکەی کرد گەڕا بە لَمْ تَصُونِي.

«لَمْ تَصُونٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب.«لَمْ تَصُنَّ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئیعلال ئەکرێن وەکو تثنیە و جمعی مؤنثی غائب.

«لَمْ أَصُنْ» بۆ متکلمی وەحدە، «وَلَمْ نَصُنْ» بۆ متکلمی مع‌الغیر ئیعلال ئەکرێن وەکو لم يَصُنْ: «وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ» وەکو: لَمْ يَصُنْ وە باقی صیغەکان وایە لە ئیعلال دا «لَمْ يَبِعْ، لَمْ يَبِيعٰا، لَمْ يَبِيعُوا، الخ...» وە «لَمْ يَخَفْ، لَمْ يَخٰافٰا، لَمْ يَخٰافُوا، الخ...»

**وَ قِسْ عَلَيْهِ الأَمْرُ، نَحْوُ: صُنْ صُونَا صُونُوا صُونِي صُونَا صُنَّ.**

«وَ قِسْ عَلَيْهِ الأَمْرُ، نَحْوُ:» جا قیاس بکە لە سەر فعلی مضارعی مجزومی معتل‌العین لە روی ئیعلال وە حەذف وە اثباتی عین‌الفعل دا فعلە ئەمرە کانیان، وەکو: ـ

«صُنْ» بۆ مفرەدی مذکری مخاطب، مشتقە لە تَصُونُ تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بو ابتدامان پیٚ کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی حەرە کە بو بە صُوْنْ جا التقاءالساکنین بو لە بەینی عین‌الفعل وە لام‌الفعلە کە یا، وە حەذفی عین‌الفعلە کە مان کرد بو بە صُنْ لە سەر وەزنی فُلْ بە حذفی عین‌الفعل.

«صُونَا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئە مرەلە تَصُونَانِ، تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە صُونا بە اثباتی عین‌الفعلە کەی لە بەر ئەوە کە مابعدە کەی متحرک بوو.

«صُونُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَصُونُونَ بوو، تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد مابعدە کەی متحرک بوو ابتدامان پیٚکرد، ئاخرمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە صُونُوا بە اثباتی عین‌الفعلە کەی لە بەر ئە وە کە مابعدە کەی متحرکە.

«صُونِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی تَصُونِيَن بوو.تیٚ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە صُونِي بە اثباتی عین‌الفعل لە بەر حەرە کەی مابعدە کەی.

«صُونَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی تَصُونَانِ بوو. وەکو تثنیەی مذکری مخاطب دروست ئەکریٚ.

وَ بِالتَّأْكِيدِ صُونَنَّ صُونَانِّ صُونُنَّ صُونِنَّ صُونَانِّ

«صُنَّ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی تَصُنَّ بوو، تێ حەرفی مضارع بوو، حەذفمان کرد گەڕا به صُنَّ.

«وَ بِالتَّأْكِيدِ» تۆ ئەڵێیت له کاتی مؤکد کردنی ئەمری مخاطب به نونی تأکیدی ثقیلەوه «صُونَنَّ» بۆ مفردی مذکری مخاطب ئه صڵه کەی صُنْ بوو، مؤکدمان کرد به نونی ثقیله، و نونی تأکید باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبله که مان مفتوح کرد جاله به رئەم فتحەیه عینالفعله محذوفه که مان ئیعاده کرده وه گەڕا به صُونَنَّ.

«صُونَانِّ» بـۆ تـثنیەی مـذکری مـخاطب، ئـەصڵه کـەی صونا بـوو، مؤکدمان کرد به نونی تأکیدی ثقیله وه، وه نونه که مان مکسور کرد گەڕا به صُونَانِّ (به اثباتی عینالفعله که، له بەر ئەوه که مابعده کەی متحرکه..)

«صُونُنَّ» بۆ جـەمعی مـذکری مـخاطب، ئـەصڵه کـەی صُـونُو بـوو، مؤکدمان کرد به نونی ثقیله وه التقاءالساکنین پەیدا بو له بەینی واوی ضمیر و نونی تأکیدا واوه که مان حەذف کرد له به رئه وه ضمەی مـاقبله کـەی دەلالەت ئه کاله سەری گەڕا به صُونُنَّ.

«صُونِنَّ»بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی صُونی بوو، مؤکدمان کرد به نونی ثقیله، جا التقاءالساکنین پەیدا بو له بەینی یێی ضمیر و نونی تأکیدا، حەذفی یێ که مان کرد له بەرێکتفا به دەلالەت کـردنی کسـرەی ماقبله کەی له سەری گەڕا به صُونِنَّ.

«صُونَانِّ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی صُونَا بـوو. وەکـو تثنیەی مذکری مخاطب وایه.

**صُنّانٍّ وَ بِعْ بِیعا بِیعُوا بِیعِی بِیعا بِعْنَ و خَفْ، خافا خافوا خافی خافا خِفْنَ، و بالتأکید: بِیعَنَّ و خافَنَّ**

«صُنّانٍّ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصلەکەی صُنَّ بوو مـؤکدمان کرد بە نونی ثقیله وە ـ وە هاتین بە ئەلفێ لە بەینی نونی جەمع وە نـونی تأکیدەکە دا وە نونە تأکیدەکە مان مکسور کرد گەڕا بە صُنّانٍّ.

«وَبِعْ» بۆ مفرەدی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَبِیعُ بو، تێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، وە مابعدی حەرفی مـضارعە کـە مـتحرک بـوو ابتدامان پێ کرد، وە ئاخرمان مجزوم کرد بە سکون، وە حەذفی عین‌الفعله کە مان کرد لە بە ردەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە بِعْ.

«بِیعا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تَبِیعانِ بوو، تێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، وە مابعدی حەرفی مضارع متحرک بوو ابتدامان پێ کرد، وە ئاخرمان مجزوم کرد بە حەذفی نون، وە عین‌الفـعله کـە مـان هێشتە وە لە بەر حەرەکەی مابعدە کەی گەڕا بە بِیعا.

«بِیعُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئـەصڵە کـەی تَـبِیعُونَ بـوو، تـێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد مابعدە کەی متحرک بوو ابتدامان پێ کرد، وە ئاخرە کەمان مجزوم کـرد بـە حـەذفی نـون گـەڕا بـە بِـیعُوا بـە اثـباتی عین‌الفعله کە لە بەر حەرەکەی مابعدە کەی.

«بِیعِی» بۆ مفرەدی مؤنثی مخاطب، ئـەصڵە کـەی تَـبِیعِینَ بـوو، تـێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتدامان پێ کرد ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی نون گـەڕا بـە بِـیعِی، بـە اثـباتی

..............................................................

عين‌الفعل له بەر حەرە کەی مابعدە کەی.

«بِيعَا» بۆ تثنيەی مخاطب وەکو تثنيەی مذکری مخاطبە. «بِـعْنَ» بـو جەمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی تَبِعْنَ بوو، تێ حەرفی مضارع بـوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتداامان پێ کرد، وە ئاخرە کە مان هێشته وە له سەر حاڵی خۆی، له بەر مـحافظەی نـونی ضـميری فـاعلی جمعی مؤنث گەڕا بە بِعْنَ.

«خَفْ» بۆ مفردی مذکری‌مخاطب، ئەصڵە کەی تَخَافُ بوو، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتداامان پێ کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم‌کرد بە سکون وە حەذفی عين‌الفعله کە مان کرد له بەر دەفعی التقاءالساکنين له بەينی ئەو و لام‌الفعله کە یا گەڕا بە خَفْ.

«خَافَا» بۆ تثنيەی مذکری مـخاطب، ئـەصڵە کـەی تَـخَافَانِ بـوو، تـێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتدمان پـێ کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە خَافَا بە اثـباتی عين‌الفعله کە.

«خَافُوا» بۆ جەمعی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَخَافُونَ بـوو، تـێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتداامان پێ کرد وە، ئاخرە کە مان مجزوم‌کرد وە بە حەذفی نون گەڕا بە خَافُوا بە اثباتی عين‌الفعله کە.

«خَافِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئـەصڵە کـەی تَـخَافِينَ بـوو، تـێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، مابعدە کەی متحرک بوو ابتداامان پێ

وَ مَزِيدُ الثُّلاثِيِّ لايُعْتَلُّ مِنْهُ اِلاّ أَرْبَعَةُ أَبْنِيَةٍ وَ هِيَ أَجابَ يُجِيبُ اِجابَةً

کرد ئاخرمان مجزوم کرد به حەذفی نون گەڕا بە خٰافی بە اثباتی عین‌الفعل کەی.

«خٰافٰا» بۆ تثنیەی مخاطب. وەکو تثنیەی مذی مخاطب وایە

«خَفْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی مخاطب، مشتقە لە تخفن تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، بە لاٚم ئاخرە کە مان مجزوم نەکرد مایە وە خَفْنَ.

«و بِاالتَّأْكِيدِ: بِيعَنَّ و خٰافَنَّ» تۆ ئە لیٚت: لە کاتی تأکیدی فعلی ئەمری تبیع و تخاف بە نونی تأکیدە وە، بیعَنَّ و خٰافَنَّ بە بنای ئاخرە کە یان لە سەر فەتحە وە ئیعادەی عین‌الفعلە کە یان.

«وَ مَزِيدُ الثُّلاثِيِّ لايُعْتَلُّ مِنْهُ اِلاّ أَرْبَعَةُ أَبْنِيَةٍ» وە ثلاثی مزید فیە لە معتل‌العین دا ئیعلال ناکریٚ ئللا چوار بینا نەبیٚ کە عیبارەتن لە بابی: ١ـ اِفعال، وە ٢ـ استفعال، وە ٣ـ انفعال، وە ٤ـ افتعال، وەکو مصنف لە بەر ترتیب فەرموی: ـ «وَ هِيَ أَجٰابَ يُجِيبُ اِجٰابَةً». وە ئیعلالی ئەم بابە بە نقلٚ‌وە قەلبە ئیستە ئەصلٚی أجاب أجوَب بوو، وەکو اکرم نقلٚی فەتحەی عین‌الفعلە کە مان کرد بۆلای فاءالفعلە کەی جا: (واو ئیستە ساکن وە سابقاً متحرک وە ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف) گەڕا بە أَجٰابَ، وە ئەصلٚی یُجیب یُجْوِبُ بوو، وەکو یکرم، کسرە لە سەر واو ثقیل بوو نقلٚمان کرد بۆلای ماقبلە کەی (وە واو ئیستە ساکن لە سابقا متحرک وە ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە ییٚ) گەڕا بە یُجِیبُ.وە ئەصلٚی اِجٰابةً اِجْوٰاباً بوو، وەکو اِکْرٰاماً نقلٚی حەرەکەی عین‌الفعلە کەمان کرد بۆلای ماقبلە کەی وە قەلبمان کرد بە

## وَاسْتَقَامَ يَسْتَقِيمُ إِسْتِقَامَةً وَانْقَادَ يَنْقَادُ اِنْقِياداً

ئەلف جا التقاءالساكنين ڕوی دا لە بەینی ئەلفی عینالفعل وە ئەلفی مصدەرەکە دا، وە حەذفی یەکیکیان کرا وە لە عوەضی ئەوا تێمان هێنا لە ئاخرەکە یە وەگەڕا بە اِجابَةً، لە سەر وەزنی اِفْعَلَةً ئەگەر، محذوف ئەلفی مصدەر بێ، وە لە سەر وەزنی اِفالَةً ئەگەر محذوف عینالفعل بێ.«وَاسْتَقَامَ يَسْتَقِيمُ إِسْتِقَامَةً» عەطفە لە سەر اجاب یجیب اجابةً وە مراد بەمە بابی استفعالە لە معتلالعیندا وە ئیعلالەکەی بە نقڵ و قەلبە، وە ئەصڵی استقام اِسْتَقْوَمَ بو، وەکو: استخرج نقڵی حەرەکەی عینالفعلەکەمان کرد بۆلای ماقبلەکەی وە قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە اِسْتَقَامَ.

ئەصڵی یَسْتَقِیم یَسْتَقْوِمْ بوو، وەکو: یَسْتَخْرِجُ کسرە لە سەر واو ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆلای ماقبلەکەی (ئەمجار واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ) گەڕا بە یَسْتَقِیمُ.

وە ئەصڵی استقامة اِسْتِقْواماً وەکو: استخراجاً، نقڵی حەرەکەی عینالفعلەکەمان کرد بۆلای ماقبلەکەی وە قەلبمان کرد بە ئەلف، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی هەر دو ئەلفەکاندا، وە حەذفی ئەلفێکمان کرد، وە لە باتی ئەو هاتین بە تێ و تنوین لە ئاخریە وەگەڕا بە استقامة، وە ئیعلالی ئەم بابەیش بە نقڵ و قەلبە.

«وَانْقَادَ يَنْقَادُ اِنْقِياداً» عەطفە لە سەر استقام الخ... وە مراد بە مە بابی انفعالە، وە ئیعلالەکەی بە قەلبە و فقط، وەصڵی اِنقادَ اِنْقَوَدَ بوو، واو متحرکماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە انقاد.

**وَاخْتٰارَ يَخْتٰارُ اِخْتِيٰاراً وَ اِذٰا بَيَّنْتَهٰا لِلْمَفْعُولِ قُلْتَ: أُجِيبَ يُجٰابُ، وَأُسْتُقِيمَ يُسْتَقٰامُ، اُنْقِيدَ يُنْقٰادُ، وَاخْتِيرَ يُخْتٰارُ**

---

وە ئەصڵی يَنْقٰاد يَنْقَوِدُ بوو، وەکو: ينقطع واو متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يَنْقٰادُ.

وە ئەصڵی انقياداً انقواداً بوو، قەلبی واوەکەمان کرد بە يێ گەڕا بە انقياداً.

«وَاخْتٰارَ يَخْتٰارُ اِخْتِيٰاراً» عەطفە لە سەر انقاد ينقاد، وە مراد بە مە بابی افتعالە، وە ئيعلالەکەی بە قەلبە وە ئەصڵی اِخْتٰارَ اِخْتَيَرَ بوو، وەکو اجتمع يێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە اِخْتٰارَ.

وە ئەصڵی يَخْتٰارُ يَخْتَيِرُ بوو، يێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يَخْتٰارُ.وە اختياراً مصدەرە لە سەر حاڵی خۆی ماوەتەوە..

**«وَ اِذٰا بَيَّنْتَهٰا لِلْمَفْعُولِ قُلْتَ: أُجِيبَ يُجٰابُ، وَأُسْتُقِيمَ يُسْتَقٰامُ، اُنْقِيدَ يُنْقٰادُ، وَاخْتِيرَ يُخْتٰارُ»**

واتە کاتێ کە ئەو چواربابە دروست بکەی بۆ اسناد ئەلای مفعول، ئەڵێت: ـ أُجِيبَ لە بنامفعولی ماضی أَجٰابَ بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵەکەی أُجْوِبَ بوو، وەکو أُكْرِمَ کسرە لەسەر واو ثقيل بوو نقڵمان کرد بۆ ماقبلەکەی، جا واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە يێ گەڕا بە أُجِيب.

وە ئەصڵی يُجٰابُ، يُجْوَبُ بوو، وەکو يُكْرَمُ نقڵی حەرەکەی واوەکەمان کرد بۆلای ماقبلەکەی، وە قلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يُجٰابُ.

..........................................................

وە ئەصڵی اجابة إِجْوَاباً بوو، وەکو اکراماً نَقْلی حەرەکەی عین‌الفعلە کە مان کرد بۆلای ماقبلە کەی وە قەلبمان کرد بە ئەلف، وە حەذفی یەکی لە ئەلفە کانمان کرد، وە بە عوضی ئە وتیٚ تأنیثمان هیٚنالە ئاخریە وە گەڕا بە إِجابةً.

وادەر کەوت ئیعلالی ئەم بابی افعالە لە بنا مفعولیش دا بە نقڵ وە قەلبە...

«وأُسْتُقِيمَ» بۆ بنا مفعول ماضی بابی استفعال ئەصڵە کەی أُسْتُقْوِمَ بوو، وەکو أُسْتُخْرِجَ نقڵی کسرەی واوەکەمان کرد بۆلای ماقبلە کەی، وە قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە أُسْتُقِيمَ.

وە ئەصڵی يُسْتَقَامُ يُسْتَقْوَمُ بوو، نەقڵی حەرەکەی واوەکەمان کرد بۆلای ماقبلە کەی، وە قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يُسْتَقَامُ وادەر کەوت ئیعلالی ئەم بابەیش بە نقڵ وە قەلبە.

وە ئەصڵی أُنْقِيدَ أُنْقُوِدَ بوو، وەکو: أُنْقُطِعَ کسرە لە سەر واو ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆ ماقبلە کەی، وە واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە أُنْقِيدَ.

وە ئەصڵی يُنْقَادُ يُنْقَوَدُ بوو، واو متحرک ماقبل مفتوح، قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يُنْقَادُ. وە ئیعلالی ئەم مضارعە مجهولە هەر بە قەلبە.

وە ئەصڵی أُخْتِيرَ أُخْتُيِرَ بوو کسرە لە سەر یێ ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆ ماقبلە کەی پاش حەذفی ضمە کەی گەڕا بە أُخْتِيرَ.

وە ئەصڵی يُخْتَارُ يُخْتَيَرُ بوو، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە

وَالأَمْرُ مِنهٰا: أَجِبْ أَجِيبٰا أَجِيبُوا، واسْتَقِمْ اِسْتَقِيمٰا، وَانْقَد وَانْقٰادٰا، وَاخْتَرْ وَاِخْتٰارٰا

---

ئەلف گەڕا بە يُخْتٰارُ.وادەرچو کە ئیعلالی ئەم مضارعە یش هەر بە قەلبە.

خولاصە بنا مفعولی ئەم چوار بابە ئەوەی واوی بێ ئیعلالە کەی بە نقلٚ وە قەلبە.وە لە بابی انفعال و افتعال دا بە قەلبە فقط.

«والْاَمْرُ مِنْهٰا» ئەمری بە صیغە لەم چوار بابا دروست ئەکرێ بە حەذفی عین‌الفعل لە مفردی مذکری مخاطب وە جمعی مؤنثی مخاطب دا وە بە اعادەی عین‌الفعل لە باقی صیغە کانا.

«أَجِبْ» مشتقە لە تُجِيبُ، تێ حەرفی مضارع بـو حـەذفمان کـرد، وە اعادەی همزەی قطع مان کردە وە، لە بەر ئەوە متحرک بوو ابتدامـان پـێ کرد، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە سکون، وە عین‌الفعلە کە مان حەذف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە أَجِبْ.

«أَجِيبٰا» مشتقە لە تُجِيبٰانِ، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کـرد، وە اعادەی همزە کە مان کردە وە، وە ئاخرمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اَجيبٰا بە اثباتی عین‌الفعلە کە لە بەر ئەوە کە مابعدە کەی متحرکە.

وە قیاسی جمعی مؤنث بکە لە سەر مفردی مذکر لە حەذفی عین‌الفعلە کە یا، وە قیاسی بـاقی صیغەکـان بکـە لە سـەر تـثنیەی مـذکر لە اثـباتی عین‌الفعلە کە یا وەکو ئەوان.

«وَاسْتَقِـمْ» مشتقە لە تَسْتَقِيمُ تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کـرد، مابعدە کەی ساکن بوو ابتدامان پێ نە کرد، جا هاتین لە ئـە وەڵـیە وە بـە

..........................................

همزەی وەصڵی مکسور وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە سکون گەڕا بە اِسْتَقِمْ بە حەذفی عین‌الفعلە کەی لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەو و لام‌الفعلە کە یا.

«اِسْتَقِیمٰا» مشتقە لە تَسْتَقِیمٰانِ تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد وە، جەلبی همزەی وەصڵمان کرد لە بەر دەفعی ابتدا بە ساکن، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِسْتَقِیمٰا بە اثباتی یێ، ئیعادەی عین‌الفعلە کەی بوو لە بەر تحرکی مابعدە کەی.

«وَانقَدْ» مشتقە لە تَنْقٰادُ تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە همزەی وەصڵە کە مان هێنایە وە، لە بەر دەفعی ابتدا بە ساکن، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە سکون، وە حەذفی عین‌الفعلە کە مان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە اِنْقَدْ.

«اِنْقٰادٰا» مشتقە لە تَنْقٰادٰانِ تیٚ حەرفی مضارع بو حەزفمان کرد، وە جەلبی همزەی وەصڵمان کردە وە لە بەر دەفعی ابتدا بە ساکن، وە ئاخرمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِنْقٰادٰا بە اعادەی عین‌الفعلە کەی لەبەر تحرکی مابعدە کەی.

«اِخْتَرْ» مشتقە لە تَخْتٰارُ، تیٚ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە جەلبی همزەی وەصڵمان کرد لە بۆ دەفعی ابتدا بە ساکن، وە ئاخرە کە مان مجزوم کرد بە سکون، وە حەذفی عین‌الفعلە کە مان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە اِخْتَرْ.

**وَ يَصِحّ نَحْوُ: قَوَّلَ وَ قَاوَلَ وَ تَقَوَّلَ وَ تَقَاوَلَ وَ زَيَّنَ و تَزَيَّنَ و سَايَرَ وَ تَسَايَرَ وَاسْوَدَّ وَاسْوَادَّ وَابْيَضَّ وَابْيَاضَّ**

---

«اِخْتَارَا» مشتقه له تَخْتَارَانِ تێ حەرفی مضارع بوو حەذمان کرد، وە جەلبی همزەی وەصڵمان کرد، وە ئاخرمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِخْتَارَا، بە اعادەی عین‌الفعله کە لە بەر تحرکی مابعده کەی.

«**وَ يَصِحّ نَحْوُ: قَوَّلَ وَ قَاوَلَ وَ تَقَوَّلَ وَ تَقَاوَلَ وَ زَيَّنَ و تَزَيَّنَ و سَايَرَ وَ تَسَايَرَ وَاسْوَدَّ وَاسْوَادَّ وَابْيَضَّ وَابْيَاضَّ**» یانی ئعلال ناکرێ معتل‌العین لە بابی: تفعیل، وە مفاعله، وە تفعُّل، وە تفاعل، وە افعلال، وە افعیلال، لە بەر ئەوە شەرتی ئیعلال ئەوە یە: ـ (واو وە یێ متحرک بن وە ماقبلە کەیان ساکن بێ وە ئەو شەرتە لە وانا نایێتە جێگە هەرگیز! چونکی لە بابی تفعیل وە تفعل‌دا ئەگەر حەرفی ئەوەڵ لە حەرفە علله کان ئعلال بکەی ئەوە هەر چەن ماقبلە کە یان متحرکە بە لام خۆیان ساکنن، وە ئەگەر حەرفی دوهەمیان ئیعلال بکەی، ئەوە هەر چەن خۆیان متحرکن بە لام ماقبلە کە یان ساکنە وە لەو مادانە داکە ئەلف والە پیشیانە وە ئەگەر ئەو ئەلفە بە حاجزی غەیری حصین دا ئەنرێ تا ماقبلە کە یان ببێ بە حەرفە مفتوحە کان، وە قەلبی واو وە یێ کە بکەی بە ئەلف وە دو ئەلف گردئەبنەوە ناچاری حەذفی یەکێکیان بکەی لە بەر دەفعی التقاءالساکنین وە لەم کاتا قَاوَلَ ئە بێ بە قال، وە سایر ئە بێ بە سار، وە ئیلتباسیان ئە بێ بە ماضی ثلاثی مجردە وە، تقاول وە تسایر ئەبن بە تقال وە تسار وە لە وەزنی فعلی مضارع دەر ئەچن.

**وَ كَذٰا سٰائِرُ تَصٰارِيفِهٰا وِاسْمُ الْفٰاعِلِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمُجَرَّدِ يُعَتَلُّ عَـيْنُهُ بِالْهَمْزَةِ كَصٰائِنٍ وَبٰائِعٍ وَ مِنَ الْمَزِيدِ فِيهِ يُعَتَلُّ بِمٰا اعْتُلَّ بِهِ الْـمُضٰارِعُ كَمُجِيبٍ وَ مُسْتَقِيمٍ وَ مُنْقٰادٍ وَ مُخْتٰارٍ**

---

«وَ كَذٰا سٰائِرُ تَصٰارِيفِهٰا» هه روا ئيعلال ناكرێ باقى مشتقاتى ئـه‌م شه‌ش بابه له مضارع وه اسمى فاعل وه اسمى مفعول، وه غه‌يرى ئه‌وانه له به‌ر ئه‌وه كه شه‌رتى ئيعلاله كه‌يان نايته جێگه وه‌كو باسمان كرد.

«**وِاسْمُ الْفٰاعِلِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمُجَرَّدِ يُعَتَلُّ عَـيْنُهُ بِـالْهَمْزَةِ كَـصٰائِنٍ وَبٰائِعٍ**».اسمى فاعل له ثلاثى مجردى معتل العين ئيعلالى عين الفعله كه‌ى ئه‌كرێ به قه‌لب كردنى به همزه، وه‌كو: صائن وه بائع، ئه‌صڵه‌كه‌يان صٰاوِنٌ وه بٰايِعٌ بوو، قه‌لبى واو و يێ كه مان كرد به همزه بوون به صٰائِنٌ و بٰائِعٌ.

«**وَ مِنَ الْمَزِيدِ فِيهِ يُعَتَلُّ بِمٰا اعْتُلَّ بِهِ الْمُضٰارِعُ كَمُجِيبٍ وَ مُسْتَقِيمٍ وَ مُنْقٰادٍ وَ مُخْتٰارٍ**».وه اسمى فاعل له معتل العين ثـلاثى مـزيد فـيه ئـيعلال ئه‌كرێ به‌و جۆره كه ئيعلالى عين الفعلى مضارعه كه‌ى ئه‌كرێ له نقڵ و قه‌لب به يه كه‌وه.وه‌كو: مُجِيبٌ بۆ اسمى فاعل له بابى افعال.وه مستقيم بۆ اسمى فاعل بابى استفعال له معتل العين دا، ئه‌صڵه‌كه‌يان مُجْوِبٌ و مُسْتَقْوِمٌ بوو، وه‌كو: مُكْرِمٌ وه مُسْتَخْرِجٌ، كسره له سه‌ر واو ثقيل بوو نـه‌قڵمان كـرد بولاى ماقبله كه‌ى، وه واو ساكن ماقبل مكسور قه‌لبمان كرد به يێ گه‌ڕان به مُجِيبٌ وه مُسْتَقِيمٌ يا هه‌ر قه‌لب به ته‌نيا وه‌كو: مُنْقٰادٌ بۆ اسمى فاعلى بابى انفعال وه مُخْتٰارٌ بۆ اسمى فاعلى بـابى افـتعال ئـه‌صڵه كـه يـان مُـنْقَوِدٌ وه مُخْتَيِرٌبو، وه‌كو: مُنْقَطِعٌ، وه مُجْتَمِعٌ، واو و يێ متحرك ماقبل مفتوح قه‌لبمان

## وَاسْمُ الْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلَاثِيِّ الْمُجَرَّدِ يُعْتَلُّ بِالْقَلْبِ وَ الْحَذْفِ كَمَصُونٍ وَ مَبِيعٍ

کرد بە ئەلف و بوون بە مُنْقَادٌ وە مُخْتَارٌ.

«وَاسْمُ الْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلَاثِيِّ الْمُجَرَّدِ يُعْتَلُّ بِالْقَلْبِ وَ الْحَذْفِ كَمَصُونٍ وَ مَبِيعٍ»

وە اسمی مفعول لە ثلاثی مجردی معتل‌العین دا ئیعلال ئەکرێ بە قەلب وە حذف وەکو: مَصُونٌ بۆ اسمی مفعول صَانَ لە بابێ ئەوەڵ دا کە ئەصڵەکەی مَصْوُونٌ بوو، بە دو واو لە سەر وەزنی مَنْصُورٌ بە ضمەی واوی ئەوەڵ وە سکونی واوی ثانی، ضمە لە سەر واو ثقیل بو نەقڵمان کرد بۆلای ماقبلەکەی، جا حەذفی واوەکەیشمان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی هەر دو واوەکە داگەڕا بە مَصُوْنٌ.

جا ئەگەر محذوف واوی عین‌الفعلەکە بێ ئەوە لە سەر وەزنی مَفُولٌ ئەبێ.وە ئەگەر واوە زائدکە بێ ئەوە لە سەر وەزنی مَفُعْلٌ ئەبێ، بە فتحەی میم وە ضمەی فاءالفعل وە سکون عین‌الفعلەکەی.

وە مَبِيعٌ بۆ اسمی مفعولی بابی ثانی لە معتل‌العینی یائی دا ئەصڵەکەی مَبْيُوعٌ بوو، وەکو مَضْرُوبٌ ضمە لە سەر یێ ثقیل بو نەقڵمان کرد بۆلای ماقبلەکەی، جا التقاءالساکنین روی دا، لە بەینی عین‌الفعل وە واوە زائدەکە دا، وە حەذفی واوەکە مان کرد گەڕا بە مَبُيْعٌ بە فتحەی میم وە ضمەی بێ وە سکونی یێ.

جا لە بەر ئەوە یێ باعثی کسرەی ماقبلی بوو، ماقبلەکە مان مکسور کرد گەڕا بە مَبِيعٌ بە کسرەی بێ و سکونی یێ.

**وَالمَحْذُوفُ واو مفعول عند سيبويه و عين الفعل عندالأخفش وَ بَنَو تَمِيمٍ يُثْبِتُونَ الْيَاءَ فَيَقُولُونَ: مَبْيُوعُ.**

---

وه يا خود ئەڵێن: ضمه له سەر یێ ثقیل بوو نەقڵمان کرد بۆلای ماقبله کەی، وه حەذفی یێ کە مان کرد له بەر دەفعی التقاءالساکنین له بەینی یێ و واوه کە داگەڕا مَبُوعٌ جا ضمه فاءالفعله کە مان کرد به کسره، وه قەلبی واوه کە مان کرد به یێ گەڕا به مَبِیعٌ له سەر وەزنی مَفِیلٌ چونکی زو عین‌الفعله کە مان حەذف کرد، وه ئەم یێ یه به دەلی واوی اسمی مفعوله کەیه.

جا له سەر وجودی ئەم دو ئیحتمالانه یه کە عیبارەتن له حەذفی عین‌الفعل وه واوی اسمی مفعول کە مصنف فەرموی: ـ «**والمحذوف واو مفعول عند سیبویه و عین الفعل عندالأخفش.**» یانی ئەو حەرفه کە حەذف کراوه لەم اسمه مفعولانه کە مَصُونٌ و مَبِیعٌ وه هاو وێنه یان له معتل‌العین دا: واوه زائده کەی بنای اسمه مفعوله کە یه به لای سیبوه یه وه، له بەر ئەوه حەرفی زائده لایقه به حەذف.

وه عین‌الفعله کە یه، کە واوه له مَصُونٌ وه یێ یه له مَبِیعٌ دا له سەر بیرو رای ئەبوالحسنی مشهور به أخفش کە شاگردی سیبویه بووه، ئەو ئەڵێ: واوی بنای اسمی مفعول عەلامەت و نیشانەی صیغەیه حەذفی نامناسبه، بەڵام عین‌الفعله کە حەرفی علله یه وه جێگەی تغیره، ئەولایقه بۆنەمان.

«**وَ بَنَو تَمِيمٍ يُثْبِتُونَ الْيَاءَ فَيَقُولُونَ: مَبْيُوعُ.**» وه عەرەبی قەبیلەی بەنی تمیم عین‌الفعلی اسمی مفعول ثلاثی مجردی أجوف ئەهێڵێنه وه له یائی دا، وه ئەڵێن: مَبْیُوعٌ له باتی مَبِیعٌ.

**وَ اِسْمُ الْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمَزِيدِ فِيهِ يُعْتَلُّ بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ اِنِ اعْتُلَّ فِعْلُهُ كَمُجٰابٍ و مُسْتَقٰامٍ و مُنْقٰادٍ و مُخْتٰارٍ**

---

«**وَ اِسْمُ الْمَفْعُولِ مِنَ الثُّلاثِيِّ الْمَزِيدِ فِيهِ يُعْتَلُّ بِالنَّقْلِ وَالْقَلْبِ اِنِ اعْتُلَّ فِعْلُهُ**» وه اسمی مفعولی معتل‌العین له ثلاثی مزید فیه‌دا ئیعلال ئه‌کریٚ به نقلی حه‌ره‌که‌ی عین‌الفعله‌که‌ی بۆلای ماقبله‌که‌ی له‌گه‌ڵ قه‌لب کردنی ئه‌و عین‌الفعله به ئه‌لف به مه‌رجیٚ فعله‌که‌ی ئیعلال کرابیٚ، وه‌کو: بابه پیٚشوه‌کان «**كَمُجٰابٍ و مُسْتَقٰامٍ و مُنْقٰادٍ و مُخْتٰارٍ**» که عباره‌تن له اسمی مفعولی بابی افعال وه استفعال وه انفعال وه افتعال، ئه‌صڵی مُجٰابٍ و مُسْتَقٰامٍ، مُجْوَبٌ و مُسْتَقْوَمٌ بوو، وه‌کو: مُكْرَمٌ وه مُسْتَخْرَجٌ نقڵی حه‌ره‌که‌ی واوه که یانمان کرد بۆلای ماقبله‌که‌ی وه قه‌لبمان کرد به ئه‌لف گه‌ڕان به مُجٰابٌ وه مُسْتَقٰامٌ، هه‌رچه‌ن شه‌رتی ئیعلالیان تیانه هاتوه‌ته جیٚگه، به‌ڵام له به‌ر ئه‌وه فعله‌کانیان ئیعلال کراوه به حه‌مل له سه‌ر مجرده‌کانیان که جاب و قام یه: وه ئه‌صڵی منقاد و مختار، مُنْقَوَدٌ وه مُخْتَيَرٌ بوو واو وه ییٚ متحرک وه ماقبل مفتوح قه‌لبمان کردن به ئه‌لف گه‌ڕان به مُنْقٰادٌ و مُخْتٰارٌ.

# اَلثَّالِثُ: اَلْمُعْتَلُّ اللاَّمُ

اَلنَّوْاعُ الثالِثُ اَلْمُعْتَلُّ اللّامُ وَ يُقْالُ لَهُ النّٰاقِصُ وَ ذُوالأَرْبَعَةِ لِكَوْنِ مٰاضِيهِ عِلٰى أَرْبَعَةِ أَحْرُفٍ إِذْا أَخْبَرْتَ عَنْ نَفْسِكَ نحو: غَزَوْتُ وَ رَمَيْتُ فَالْمُجَرَدُ الثُّلاثِيُّ تُقْلَبُ الْواوُ وَالْياءُ مِنْهُ أَلِفاً إِذْا تَحَرَكَتا وَانْفَتَحَ مٰاقَبْلَهُمٰا كغَزٰى و رَمٰى

---

نەوعی سێ هەم لە حەوت نەوعەی معتل فعلێکە یا اسمێکە لام‌الفعلە کەی حەرفێ بێ لە حروفی علله «اَلنَّوْاعُ الثالِثُ اَلْمُعْتَلُّ اللّامُ وَ يُقْالُ لَهُ النّٰاقِصُ» وە بەم معتل‌اللامە ئەوترێ: ناقص، لە بەر نوقصانی ئاخرەکەی لە صحەت.

«وَ ذُوالأَرْبَعَةِ» هەم پێ‌ی ئەوتری ذوالأربعة «لِكَوْنِ مٰاضِيهِ عِلٰى أَرْبَعَةِ أَحْرُفٍ إِذْا أَخْبَرْتَ عَنْ نَفْسِكَ».

لە بەر ئەوە کە ماضی‌یە کەی لەسەر چوار حەرف ئەبێ کاتێ کە خەبەری پێ بدەی لە نفسی خۆت، مثلاً «نحو: غَزَوْتُ وَ رَمَيْتُ» غەزام کرد وە تیرم ئاویشت، ئیستە ئەم فعلالە هەرچەن لە زاتی خۆیاندا سێ حەرفن، بە لاّم لەبەر ئەوە کە ضمیری مرفوع یان پێوە لکاوە، وە ئەو ضمیری فاعلەیش وەکو جوزئێ وایە لە وان بە چوار حەرفی دانراون «فَالْمُجَرَدُ الثُّلاثِيُّ تُقْلَبُ الْواوُ وَالْياءُ مِنْهُ أَلِفاً إِذْا تَحَرَكَتا وَانْفَتَحَ مٰاقَبْلَهُمٰا» واتە فعل وە اسمی ثلاثی مجرەدی معتل‌اللام قەلبی واو وە یێ کە یان ئەکرێ بە ئەلف کاتێ کە متحرک بن، وە ئەو حەرفە والە پێشیانە وە مفتوح بێ: «كغَزٰى و رَمٰى» ماضی بابی ئەوەڵ و ثانی، ئەصڵەکە یان غَزَوَ

## وَ عَصاً وَ رَحًى وَ كَذٰلِكَ الزّائِدُ عَلٰى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ كَأَعْطٰى وَاشْتَرٰى وَاسْتَقْصٰى و كَالْمُعْطٰى وَالْمُشْتَرٰى وَالْمُسْتَقْصٰى

و رَمَيَ بوو، واو وه يێ متحرك وه ماقبله كه‌يان مفتوح بۆ قه‌لبمان كردن به ئه‌لف گه‌ڕان به غَزا و رَمَىٰ «وَ عَصاً وَ رَحًى» بۆ دو اسمی ثلاثی مجردی معتل‌اللام ئه‌صڵه كه يان عَصَوٌ و رَحَيٌ بو واو يێ متحرك وه ماقبل مفتوح قه‌لبمان كردن به ئه‌لف ئینجا التقاءالساكنين ڕوی داله به‌ینی ئه‌لف وه تنوينه كه دا، حه‌ذفی ئه‌لفه كانمان كرد له لفظانه‌ك له نوسينابون به عصاً و رحیً، ئاگادار بن ئه‌لفێ كه ئه‌صڵه كه‌ی واو بێ به ئه‌لف ئه‌نوسرێ، وه ئه‌لفێ ئه‌صڵه‌كه‌ی يێ بێ به (ی) ئه نوسرێ، «وَ كَذٰلِكَ الزّائِدُ عَلٰى ثَلاثَةِ أَحْرُفٍ كَأَعْطٰى وَاشْتَرٰى وَاسْتَقْصٰى و كَالْمُعْطٰى وَالْمُشْتَرٰى وَالْمُسْتَقْصٰى» واته وه‌كو فعل و اسمی ثلاثی مجردی معتل‌اللام وايه له ئيعلال دا هه‌ر فعل و اسمی كه زياد بن له سه‌ر سێ حه‌رف، وه‌كو: أَعْطٰى بۆ ماضی مفردی مذكری غائب له بابی افعال دا، ئه‌صڵه كه‌ی أَعطَوَ بوو، وه‌كو أكرم، قاعده: (واو واقع له مرتبه‌ی چواره‌م دا، قه‌لبمان كرد به يێ، وه يی متحرك ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف، گه‌ڕا به أَعْطٰى، وه إِشْتَرَىٰ بۆ ماضی مفردی مذكری غائب له بابی افتعال دا، ئه‌صڵه كه‌ی إِشْتَرَيَ بوو، وه‌كو: اجتمع، يێ متحرك ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف، گه‌ڕا به اشترىٰ، كه به‌يی ئه نوسری و به ئه‌لف ئه خوێنرێنه وه.وه اسْتَقْصٰى ئه‌صڵه كه‌ی اسْتَقْصَوَ بوو، وه‌كو استخرج، واو واقع له مرتبه‌ی چواره‌م دا قه‌لبمان كرد به يێ، وه‌يی متحرك ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف له لفظاوه له

نوسين دا به یێ نوسیمان گه‌ڕا به اِسْتَقْصٰی.

وه مُعْطَىً اسمی مفعولی بابی افعال، ئه‌صڵه که‌ی مُعْطَوٌ بوو به واو، له سه‌ر وه‌زنی مُكْرَمٌ واو له مرتبه‌ی چواره‌مدا قه‌لبمان كرد به یێ، وه یێ متحرک ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف گه‌ڕا به مُعْطٰی كه به ئه‌لف ئه‌خوێنرێته وه وه به یێ ئه‌نوسرێ، وه مُشْتَرٰی اسمی مفعول بابی افتعال بوو، وه‌کو: مجتمع، یێ متحرک ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف گه‌ڕا به مُشْتَرٰی به ئه‌لف ئه خوێنرێته وه و به یێ ئه‌نوسرێ.

وه مُسْتَقْصٰی اسمی مفعولی بابی استفعاله، وه‌کو مستخرج ئه‌صڵه که‌ی مُسْتَقْصَوٌ بوو، واو له مرتبه‌ی چواره‌مدا قه‌لبمان كرد به یێ، وه یێ متحرک ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف گه‌ڕا به مُسْتَقْصٰی كه ئه خوێنرێته وه به ئه‌لف وه ئه‌نوسری به یێ.

«وَ كَذٰلِكَ اِذٰالَمْ يُسَمَّ الفٰاعِل مِنَ الْمُضٰارِعِ كَيُعْطٰى وَ يُغْزٰى وَ يُرْمٰى» هه‌روه‌ها فعلی مضارع ئیعلال ئه‌کرێ کاتێ که ناوی فاعله که‌ی نه‌برێ، وه‌کو: يُعْطٰى بۆ بنا مفعولی مضارعی افعال له معتل اللام دا، ئه‌صڵه که‌ی يُعْطَوُ بوو، وه‌کو يُكْرَمُ واو له مرتبه‌ی چواره‌م دا قه‌لبمان كرد به یێ، وه یێ متحرک ماقبل مفتوح قه‌لبمان كرد به ئه‌لف گه‌ڕا به يُعْطٰى.وه يُغْزٰى بۆ بنا مفعولی مضارعی بابی ئه‌وه‌ڵ له معتل اللام دا ئه‌صڵه که‌ی يُغْزَوُ بوو، واو له مرتبه‌ی چواره‌مدا قه‌لبمان كرد به یێ، وه قه‌لبی یێ که مان كرد به ئه‌لف گه‌ڕا به يُغْزٰى ئه‌نوسرێ به یێ له به‌ر ئه‌وه واوه که‌ی قه‌لب كراوه به یێ، وه

**وَ أَمَّا الْماضِی فَتُحْذَفُ مِنْهُ اللاّمُ فِی مِثالِ فَعَلُوا مُطْلَقاً وَ فَعَلَتْ وَ فَعَلَتا اِذٰا انْفَتَحَ ما قَبْلَهُما وَ تَثْبُتُ فِی غَیْرِها فَتَقُولُ: غَزٰا غَزَوٰا، غَزَوْا*غَزَتْ، غَزَتٰا، غَزَوْنَ**

به ئەلف ئە خوێنرێته وه.

وه یُرْمٰی بۆ بنا مفعولی بابی ثانی له معتل‌اللام دا ئەصڵه کەی یُرْمَیُ بوو، وەکو: یُضْرَبُ یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد به ئەلف گەڕا به یُرْمٰی.

جا له بەر ئەوه بازی ئه حواڵ دێت به سەر لام‌الفعلی معتل اللّاما، مصنف بۆ باسی ئەوانه فەرموی: ـ

**«وَ أَمَّا الْماضِی فَتُحْذَفُ مِنْهُ اللاّمُ فِی مِثالِ فَعَلُوا مُطْلَقاً وَ فَعَلَتْ وَ فَعَلَتا اِذٰا انْفَتَحَ ما قَبْلَهُما وَ تَثْبُتُ فِی غَیْرِها»**

واته بۆ باسی ئەحواڵی لام‌الفعلی معتل‌اللام مصنف باسی ماضی خسته پێشه وه لەسەر تەرىبی واقعی وه فەرموی: ـئەمما فعلی ماضی ئەوه حەذفی لام‌الفعله کەی ئەکرێ له مثالی جمعی مذکری غائبا مطلقاً مفتوح‌العین بێ وەکو: غَزٰا و رَمٰی، یا مکسورالعین بێ وەکو: نَسِیَ، یا مضموم‌العین بێ وەکو: سَرُوَ له سەر وەزنی حَسُنَ وه واوی بێ یا یائی، له بەر ئەوه لام‌الفعله که مضموم ئه کرێ له بەر ضمیری جەمع، وه ضمه له سەر واو و یێ ثقیله وه هەم لام‌الفعله که حەذف ئەکرێ له مثالی مفردی مؤنثی غائب وه تثنیەی مؤنثی غائبا به مەرجێ که ماقبله کەی مفتوح بێ، وه له غەیری ئەوانا ئەمێنێتەوه، **«فَتَقُولُ»** تۆ ئەڵێیت

**«غَزٰا»** بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵه کەی غَزَوَ بوو، واو متحرک

..........................................................

ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە غَزٰا.

«غَزَوٰا» بۆ تـثنیەی مـذکری غـائب، ئـەصڵە کـەی غَـزَوَ بـوو، ئـەلف ضمیری فاعلی تثنیە بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وەگەڕا بە غَزَوٰا، وە قەلبی واوە کە مان نە کرد ئەگەرچی متحرک وە ماقبلی مفتوح بوو، چـونکی لە پاش قەلبە کەی بە ئەلف بە ناچاری حەذفی یەکی لە ئەلف کانمان ئە کرد جا ئیلتباسی تثنیە ئە بوو بە مفرد

«غَزَوْا» بۆ جمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی غَزَوَ بوو، واو ضمیری فاعلی جمعی مذکر بو ئیلحاقمان کرد بـە ئـاخریەوە، واو بـاعثی ضـمەی ماقبل بوو، ماقبلە کەمان مضموم کرد گەڕا بە غَزَوُوْا لە سەر وەزنی فَعَلُو جا واو متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە غَزٰاوْ، وە ئەلفە کە مان حەذف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە غَزَوْا لە سەر وەزنی فَعَوْا بە حەذفی لام چونکی لە موزونە کە دا حەذف کراوە.

«غَزَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی غَـزَوَ بـوو، تـیٚ تأنـیثی ساکنە علامەتی مفردی مؤنث بو ئیلحاقمان کرد بـە ئـاخریە وە گـەڕا بـە غَزَوَتْ، واو متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، وە ئەلفە کە یشمان حەدف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەو و تیٚی تأنیثە کە دا گەڕا بە غَزَتْ لە سەر وەزنی فَعَتْ بە حەذفی لامالفعل.

«غَزَتٰا» بۆ تـثنیەی مـؤنثی غـائب، ئـەصڵە کـەی غَـزَتْ بـوو، ئـەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو ئیلحقمان کـرد بـە ئـاخریە وە وە ئـەلف بـاعثی

**غَزَوْتَ، غَزَتُمٰا، غَزَوْتُم، غَزَوْتِ، غَزَوْتُمٰا، غَزَوْتُنَّ، غَزَوْتُ، غَزَوْنٰا وَ رَمٰی رَمَیٰا**

فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کە مان مفتوح کرد گەڕا بە غَزَتٰا، بە حەذفی لام‌الفعل لە سەر وەزنی فَعَتٰا.

«غَزَوْنَ» بۆ جمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی غَزَتْ بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنث ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە غَزَتْنَ جا دو علامەتی تانیث گرد بوو نە وە، دروست نە بو حەذفی نونە کە بکەین لە بەر ئەوە دەلاڵەتی ئە کرد لە سەر تأنیث وە جەمعیەت، وە حذفی تێ کە مان کرد لە بەر ئە وەکە هەر دەلالەتی لە سەر تأنیث ئە کرد، وە لام‌الفعلە کە مان هێنایەوە لە بەر نەمانی موجبی حەذفە کەی کە التقاءالساکنین بوو، گەڕا بە غَزَوْنَ.

«غَزَوْتَ، غَزَتُمٰا، غَزَوْتُم، غَزَوْتِ، غَزَوْتُمٰا، غَزَوْتُنَّ، غَزَوْتُ، غَزَوْنٰا» بۆ شەش صیغەی مخاطب، وە دو صیغەی متکلم، ئە مانە هەر وەکو: فعلی سالم دروست ئە کرین.

«وَ رَمٰی» بۆ مفردی مذکری غائب لە معتل‌اللامی بابی ثانی دا، ئەصڵە کەی رَمَیَ بوو، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە رَمَیٰ.

«رَمَیٰا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی رَمَیٰ بوو، ئەلف فاعلی ضمیری تثنیە بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە وە ئەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ئەلفە کەمان بردە وە سەر ئەصڵە کەی کە یێ بوو، وە مفتوحمان کرد گەڕا بە رَمَیٰا.

**رَمَوْا رَمَتْ رَمَتَا رَمَيْنَ رَمَيْتَ، رَمَيْتُمَا، رَمَيْتُمْ، رَمَيْتِ، رَمَيْتُمَا، رَمَيْتُنَّ، رَمَيْتُ، رَمَيْنَا وَ تَقُولُ**

«رَمَوْا» بۆ جمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی رَمَیٰ بوو، واو فاعلی جمعی مذکر بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، واو باعثی ضمەی ماقبلی بوو، یێ کە مان ئیعادە کردە وە بە مضمومی گەڕا رَمَيُوا، لە سەر وەزنی فعلوا ضمە لە سەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد، یا خود یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، وە لە بەر التقاءالساکنین حەذفی لامالفعلە کە مان کرد، گەڕا بە رَمَوْا بە فتحەی عینالفعل لە سەر وەزنی فَعَوْا لە بەر حەذفی لامالفعلە کە وەکو حاڵیت بوو.

«رَمَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی رَمَیٰ بو تیێ تأنیثی ساکنە علامەتی تأنیثی فاعل بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە رَمَيَتْ، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف وە حەذفمان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە رَمَتْ

«رَمَتَا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی رَمَتْ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە رَمَتَا.

«رَمَيْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی رَمَتْ بو، نون ضمیری فاعلی جەمعی مؤنث ئیلحاقمان کرد بە ئاخرکە یە وە، وە دروستمان کرد وەکو: غزون.

«رَمَيْتَ، رَمَيْتُمَا، رَمَيْتُمْ، رَمَيْتِ، رَمَيْتُمَا، رَمَيْتُنَّ، رَمَيْتُ، رَمَيْنَا» وە ئەم هەشت صیغەیە دروست ئەکرێن وەکو صیغە سالمە کان.«وَ تَقُولُ» تۆ

## رَضِيَ رَضِيَا رَضُوا رَضِيَتْ رَضِيَتَا رَضِينَ

ئەلیێت لە فعلی ماضی معتل اللامی بابی رابع دا:

«رَضِيَ» بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵە کەی رَضِوَ بوو، واو لە تەرەفەوە ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە رَضِيَ.

«رَضِيَا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی رَضِيَ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە رَضِيَا.

«رَضُوا» بۆ جەمعی مذکر غائب، ئەصڵە کەی رَضِيَ بوو، واو ضمیری فاعلی جەمعی مذکر بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، واو باعثی ضمەی ماقبلی بوو ماقبلە کەمان مضموم کرد گەڕا بە رَضِيُوا، ضمە لە سەر واو ثقیل بوو نقڵمان کرد بۆلای ماقبلە کەی، وە یێ کە مان حەذف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەوو واوە کەدا گەڕا بە رَضُوا لە سەر وەزنی فَعُوا.

«رَضِيَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی رَضِيَ بوو، تێی تأنیثی ساکنە عەلامەتی مفردی مؤنثی غائب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە رَضِيَتْ.

«رَضِيَتَا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی رَضِيَتْ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، وە ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کە مان مفتوح کرد گەڕا بە رَضِيَتَا.

«رَضِينَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصلە کەی رَضِيَتْ بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنث بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە گەڕا بە رَضِيَتْنَ جا حەذفی تیی تأنیثی مفردە کەمان کرد، وەکو: لە رَمَيْنَ دا گەڕا بە رضين.

رَضِيتَ، رَضِيتُمَا، رَضِيتُمْ، رَضِيتِ، رَضِيتُمَا، رَضِيتُنَّ، رَضِيتُ، رَضِينَا... وَكَذٰلِكَ سَرُوَ، سَرُوَا، سَرُوْا، ...الخ...

«رَضِيتَ، رَضِيتُمَا، رَضِيتُمْ، رَضِيتِ، رَضِيتُمَا، رَضِيتُنَّ، رَضِيتُ، رَضِينَا...» ئەم هەشت صیغەیە دروست ئەکرێن وەکو صیغە سالمەکان لە بابی رابع دا.

«وَكَذٰلِكَ سَرُوَ، سَرُوَا، سَرُوْا، ...الخ...» وەکو ماضی مفتوح‌العین وە مکسورالعین وایە لە ئیعلالی لام‌الفعل دا، ماضی مضموم العین وەکو: «سَرُوَ» بۆ مفردی مذکری غائب.

«سروا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی سَرُرَ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە سَرُوَا.

«سَرُوْا» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی سَرُوَ بوو، واو ضمیری فاعلی جمعی مذکر بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، واو باعثی ضمەی ماقبلی بو ماقبلە کەمان مضموم کرد گەڕا بە سَرُوُوْا بە دو واو، جا ضمە لە سەر واو ثقیل بوو حەذفمان کرد، وە حەذفی واوە لام‌الفعلە کەمان کرد گەڕا بە سَرُوْا لە سەر وەزنی فَعُوا.

«سَرُوَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی سَرُوَ بوو، تێی تأنیثی ساکنە عەلامەتی تأنیثی فاعل بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە سَرُوَتْ.

«سَرُوَتَا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی سَرُوَتْ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە سَرُوَتَا.

وَاِنَّمٰا فُتِحَت مٰاقَبْلَ وٰاوِ الضَّميرِ فِي: غَزَوْا، وَرَمَوْا و ضُمّت مٰاقَبْلَهٰا فِي رَضُو و سَرُوْا، لِأَنَّ وٰاوَ الضَّميرِ اِذٰا اتَّصَلَتْ بِالْفِعْلِ النّٰاقِصِ بَعْدَ حَذْفِ اللاّمِ، فَأِنِ انْفَتَحَ مٰاقَبْلَهٰا أبقِيَ عَلَى الْفَتْحَةِ، وَ اِنِ انْضَمَّ مٰاقبْلَهٰا أوْ كُسِرَ ضُمَّ.

---

«سَرُوْنَ» بۆ جەمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی سَرُوَتْ بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنث بو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە سَرُوَتْنَ اجتماعی دوو عەلامەتی تأنیث بوە وە دروست نەبوو حەذفی نونە کە بکەین چونکی دەلالەتی کرد لە سەر تأنیث و جمعیەت، وە حەذفی تێیە کەمان کرد چونکە دەلالەتی ئەکرد لەسەر تأنیث فقط گەڕا بە سَرُوْنَ.

«سَرُوْتَ، سَرُوْتُمٰا، سَرُوْتُمْ، سَرُوْتِ، سَرُوْتُمٰا، سَرُوْتُنَّ، سَرُوْتُ، سَرُوْنٰا» ئەم هەشت صیغە دروست ئەکرێن، وەکو: فعلی سالم لە بابی سادس دا.

جالە بەر ئەوە لەم شوێنا پرسیار ئە کرێ بۆچی لە صیغەی جمعی مذکری غائب لە مفتوح‌العین دا عین‌الفعلی معتل‌اللام بە مفتوحی ئەخوێنرێتەوە، وە لە مضموم‌العین وە مکسورالعین دا بە مضمومی ئەخوێنرێتە وە؟مصنف جوابی دایە وە فەرموی: ـ «وَاِنَّمٰا فُتِحَت مٰاقَبْلَ وٰاوِ الضَّميرِ فِي: غَزَوْا، وَرَمَوْا و ضُمّت مٰاقَبْلَهٰا فِي رَضُو و سَرُوْا، لِأَنَّ وٰاوَ الضَّميرِ اِذٰا اتَّصَلَتْ بِالْفِعْلِ النّٰاقِصِ بَعْدَ حَذْفِ اللاّمِ، فَأِنِ انْفَتَحَ مٰاقَبْلَهٰا أبقِيَ عَلَى الْفَتْحَةِ، وَ اِنِ انْضَمَّ مٰاقبْلَهٰا أوْ كُسِرَ ضُمَّ.»

چونکە لە پاش حەذفی لام‌الفعل لە جمعی ماضی ناقص‌دا ئەگەر ماقبلی لام‌الفعل مفتوح بێ ئەوە ئەو ماقبلە لەسەر فەتحە ئە هێڵرێتە وە

وَ أَمَّا الْمُضَارِعُ فَتَسْكُنُ اللاَّمُ مِنْهُ فِي الرَّفْعِ، وَ يُحْذَفُ فِيالْجَزْمِ، وَ تُفْتَحُ الْوَاوُ وَالْيَاءُ فِي النَّصبِ وَ تَثْبُتُ الأَلِفُ بِحَالِهَا وَ يَسْقُطُ الْجَازِمُ وَالنَّاصِبُ النُّونَاتِ سِوَى نُونِ الْجَمْعِ الْمُؤَنَّثِ

---

لەبەر سوكی فەتحە.وە ئەگەر مضموم یا مكسور بوو، ئەوە مضموم ئەكرێ لە بەر مناسبەی لە گەڵ واوە ضمیرە كە لە هەردویانا، وە هێشتنە وەی لەسەر حاڵی خۆی لە مضمومالعین دا، وە هەر بەم دەستورە لە هەر دو لفیفە كاندا وەلە مهموزی معتلاللاما معاملە ئەكرێ...

«وَ أَمَّا الْمُضَارِعُ فَتَسْكُنُ اللاَّمُ مِنْهُ فِي الرَّفْعِ، وَ يُحْذَفُ فِيالْجَزْمِ، وَ تُفْتَحُ الْوَاوُ وَالْيَاءُ فِي النَّصبِ وَ تَثْبُتُ الأَلِفُ بِحَالِهَا»

وە ئەمما فعلی مضارعی معتلاللّام، ئەوە لامالفعلەكەی ساكن ئەكرێ لە حاڵەتی رەفعە دا، وە رەفعە كەی تقدیر ئەبێ خواه لامالفعل ئەلف بێ وەكو: یَرْضی یا خود واو بێ وەكو: یَغْزُو یا خود یێ بێ وەكو یَرْمِی، لە بەر ئەوە كە ئەلف قەبوڵی حەرەكە ناكات مطلقا، وە رەفعە لەسەر واو وە یێ ثقیلە، وە لامالفعلە كەی حەذف ئەكرێ لە حاڵی جەزمەدا وە جەزمەی لفظی ئەبێت مطلقا، وە نصبە لە بەر ئەوە خفیفە لە سەر واو وە یێ لفظی ئەبێ، وەلە سەر ئەلف تقدیری ئە بێ چونكی ئەلف قبولی حەرەكە ناكا وەكو وتمان..«وَ يَسْقُطُ الْجَازِمُ وَالنَّاصِبُ النُّونَاتِ سِوَى نُونِ الْجَمْعِ الْمُؤَنَّثِ» وەكاتێ عاملی جازم وە ناصب داخڵ بون لەسەر فعلی مضارعی معتلاللام وە هاكە نون لە ئاخریە وە ببێ، ئەوە ئەو عاملانە حەذفی ئەو نونانە ئەكەن، لە حاڵی نەصبە و جەزمە دا، ئللا نونی جمعی مؤنثی غائب

**فَتَقُولُ لَمْ يَغْزُ لَمْ يَغْزُوا لَمْ يَغْزُوْ لَمْ تَغْزُ لَمْ تَغْزُوا لَمْ يَغْزُونَ وَلَمْ يَرْمِ، لَمْ يَرْمِيا، لَمْ يَرْمُوا**

---

وە مخاطب، ئەوەلە جێگەی خویانا ئە مێننە وە، چونکە ئەو نونە ضمیری فاعلە، وە فاعل عمدەیە حەذف ناکرێ، بە ڵام نونە کانی ئەفعالی خمسە نونی ئیعرابن لە حاڵەتی رەفعەدا ثابت وە لە حاڵەتی نصبە و جەزمە دا ئەڕۆن..

«فَتَقُولُ لَمْ يَغْزُ» تۆ ئەڵێیت: لە کاتی داخڵ بونی عاملی جازم لەسەر فعلی مضارعی معتل‌اللام لَمْيَغْزُ، ئەصڵە کەی يَغْزُوْ بوو عاملی جازمی داخڵ بوە سەر، وە حەذفی لام‌الفعلە کەی کرد بوو بە لَمْيَغْزُ.

«لَمْ يَغْزُوا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی يَغْزُوانِ بو عاملی جازمی داخڵ بوە سەر وە حەذفی نونە کەی کرد گەڕا بە لَمْيَغْزُوا.

«لَمْ يَغْزُوْ» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی یغزون بوو، عاملی جازم داخڵ بوە سەری و حەذفی نونە کەی کرد گەڕا بە لَمْيَغْزُوا.

«لَمْ تَغْزُ» بۆ مفردی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی تَغْزُوْ بوو، عاملی جازمی داخڵ بوە سەری حەذفی لام‌الفعلە کەی کرد گەڕا بە لَمْتَغْزُ.

«لَمْ تَغْزُوا» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی تَغْزُوانِ بوو، عاملی جازمی داخڵ بوە سەری حەذفی نونە کەی کرد گەڕا بە لَمْ تَغْزُوا.

«لَمْ يَغْزُونَ» بۆ جمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی يَغْزُونَ بوو، عاملی جازمی داخڵ بوو، عەمەلی نە کرد لە لفظا بەس عەمەلی کرد لە معنایا بە نفی مەعنا کەی لە زەمانی ماضی‌داگەڕا بە لَمْيَغْزُونَ.«وَلَمْ يَرْمِ، لَمْ يَرْمِيا، لَمْ يَرْمُوا».

**وَلَمْ يَرْضَ، لَمْ يَرْضَيا، لَمْ يَرْضَوْا وَ تَقُولُ لَنْ يَغْزُو، وَلَن يَرْمِيَ، وَ لَن يَرْضٰى وَ تَثْبُتُ لامُ الْفِعْلِ فِى الأَثْنَيْنِ وَ جَماعَةِ النِّساءِ**

---

وە «لَمْ يَرْمِ» بۆ مفردی مذکری غائب، بە حەذفی یی ی لام‌الفعل.

«لَمْ يَرْمِيا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی یرمیان بوو، عاملی جازمی داخڵ بوە سەری، وە حەذفی نونەکەی کردگەڕا بە لم یرمیا «وَلَمْ يَرْضَ، لَمْ يَرْضَيا، لَمْ يَرْضَوْا».

«لَمْ يَرْضَ» بو مفردی مذکری غائب، ئەصڵەکەی یَرْضیٰ بوو، عاملی جازمی داخڵ بوو، و حەذفی ئەلفی لام‌الفعلی کردگەڕا بە لَمْ یَرْضَ.

«لَمْ يَرْضَيا» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵەکەی یرضیان بوو، عاملی جازمی داخڵ بوە سەری، وە حەذفی نونەکەی کردگەڕا بە لَمْ یَرْضَیا. «وَ تَقُولُ لَنْ يَغْزُوَ، وَلَن يَرْمِيَ، وَ لَن يَرْضٰى» تۆ ئەڵێیت لەکاتی داخڵ بونی عاملی ناصب لە سەر فعلی مضارعی معتل‌اللام «لَنْ يَغْزُوَ» ئەصلەکەی یَغْزُو بوو بە سکونی واو، عاملی ناصبی داخڵ بوە سەری، لام‌الفعلەکەی منصوب کردگەڕا بە لَنْ یَغْزُوَ.

«وَلَنْ يَرْمِيَ، وَلَنْ يَرْضٰى» ئەصڵی لن یَرْمِیَ، یَرْمِیْ بوو، عاملی ناصبی داخڵ بوە سەر ضمە تقدیری‌یەکەی گوڕی بە نصبە گەڕا بە لَنْ یَرْمِیَ.

وَلَنْ یَرْضٰی ئەصڵەکەی یَرْضیٰ بوو، عاملی ناصبی داخڵ بوە سەر، بەلام لە بەر ئەوە ئاخرەکەی ئەلف بوو، وە قبوڵی حەرەکەی نەکرد ضمە تقدیری یەکە مان گوڕی بە نصبەی تقدیری گەڕا بە یَرْضٰی.

«وَ تَثْبُتُ لامُ الْفِعْلِ فِى الأَثْنَيْنِ وَ جَماعَةِ النِّساءِ» لام‌الفعلی

وَ تُحْذَفُ فِی فِعْلِ جَمَاعَةِ الذُّكُورِ وَ فِی الْوَاحِدَةِ الْمُخَاطَبَةِ، فَتَقُولُ: يَغْزُو، يَغْزُوَانِ، يَغْزُونَ ـ تَغْزُو، تَغْزُوَانِ، يَغْزُونَ/تَغْزُو، تَغْزُوَانِ، تَغْزُونَ ـ تَغْزِينَ، تَغْزُوانِ، تَغْزُونَ ـ أَغْزُو، نَغْزُو

---

مضارعی معتل‌اللام ئه‌ مێنێته‌ وه‌ له‌ فعلی تثنیه‌ و جمعی مؤنث‌دا مطلقا.

«وَ تُحْذَفُ فِی فِعْلِ جَمَاعَةِ الذُّكُورِ وَ فِی الْوَاحِدَةِ الْمُخَاطَبَةِ، فَتَقُولُ: به‌ڵام حه‌ذف ئه‌کرێ لام‌الفعل له‌ فعلی جمعی مذکر و مفردی مؤنثی مخاطب: ئه‌ڵێیت

«يَغْزُو» بۆ مفردی مذکری غائب، ئه‌صڵه‌که‌ی یغزوُ بوو، به‌ ضمه‌ی له‌فظی وه‌کو: ینصر فقط له‌ به‌ر ئه‌وه‌ ضمه‌ له‌ سه‌ر واو ثقیل بوو حه‌ذفمان کرد گه‌ڕا به‌ یغزو به‌ سکونی واو. «يَغْزُوَانِ» بۆ تثنیه‌ی مذکری غائب، ئه‌صڵه‌که‌ی یغزو بوو، ئه‌لف ضمیری فاعلی تثنیه‌ بوو له‌گه‌ڵ نونی ئیعرابدا ئیلحاقمان کرد به‌ ئاخریه‌ وه‌، ئه‌لف باعثی فتحه‌ی ماقبلی بوو، ماقبله‌که‌مان مفتوح کرد، گه‌ڕا به‌ یَغْزُوَانِ.

«يَغْزُونَ» بۆ جه‌معی مذکری غائب، ئه‌صڵه‌که‌ی یَغْزُوُوْنَ بوو به‌ دو واو وه‌کو: ینصرون به‌ ضمه‌ی واوی لام‌الفعل ضمه‌ له‌سه‌ر واو ثقیل بوو لامان برد، وه‌ حه‌ذفیشمان کرد له‌به‌ر التقاءالساکنین له‌ به‌ینی خۆی و واوی ضمیره‌که‌ داگه‌ڕا به‌ یَغْزُوْنَ، له‌ سه‌ر وه‌زنی یَفْعُونَ.

«تَغْزوُ» بو مفردی مؤنثی غائب.

«تَغْزُوانِ» بو تثنیه‌ی مؤنثی غائب، وه‌کو: یغزو، یغزوان.

«يَغْزُونَ» بۆ جمعی مؤنثی به‌ اثباتی واوی لام‌الفعل له‌ سه‌ر وزنی یَفْعُلْنَ، وه‌کو: یَنْصُرْنَ.

وَ يَسْتَوِي فِيهِ لَفْظُ جَمَاعَةِ الذُّكُورِوَالإِنَاثِ فِي الْخِطَابِ وَالْغَيْبَةِ جَمِيعاً وَ لٰكِنَّ التَّقْدِيرَ مُخْتَلِفٌ

---

«تَغْزوُ» بۆ مفردی مذکری مخاطب. «تَغْزُوانِ» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب. «تَغْزوُنَ» بۆ جمعی مذکری مخاطب.دروست ئە کرێن وەکو: مفرد و تثنیە و جمعی مذکری غائب.

«تَغْزِينَ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی تغزوین بوو بە کسرەی واوی لام‌الفعل، وەکو: تَنْصُرِينَ کسرە لە سەر واو ثقیل بوو، نقڵمان کرد بۆلای ماقبلە کەی، وە حەذفی واوە کەیشمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەو و یێ کە داگەڕا بە تَغْزِينَ، لە سەر وەزنی تَفْعِينَ بە حەذفی لام‌الفعل.

«تَغْزُوانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب. «تَغْزُونَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب بە اثباتی واوی لام‌الفعل لە سەر وەزنی تَنْصُرْنَ.

«أَغْزُو» بو متکلمی وحدە.

«نَغْزُو» بۆ متکلمی مع‌الغیر، بە حەذفی حرکەی واوە لام‌الفعلە کە یان.

«وَ يَسْتَوِي فِيهِ لَفْظُ جَمَاعَةِ الذُّكُورِوَالإِنَاثِ فِي الْخِطَابِ وَالْغَيْبَةِ جَمِيعاً» واتە: وەکو یەک ئەبن لە لفظا صیغەی جمعی مذکرو جمعی مؤنثی معتل‌اللام لە مخاطب وە لە غائبا مثلاً ئەڵێین: ـ یغزون بو جمعی مذکر و جمعی مؤنث غائب.

وە ئەڵێین: ـ تَغْزُونَ بۆ جمعی مذکر و جمعی مؤنثی مخاطب.«وَ لٰكِنَّ التَّقْدِيرَ مُخْتَلِفٌ» بەڵام ئەوانە لە یەکتر جیان، بە تەماشا کردنی ئەصڵە کانیان. مثلاً يَغْزُونَ لە جەمعی مذکری غائب‌دا تقدیرە کەی يَغْزُوُوْنَ یە بە

**فَوَزْنُ جَمْعُ الْمُذَكَّرِ: يَفْعُونَ وَ تَفْعُونَ وَ وَزْنُ جَمْعِ الْمُؤَنَّثِ: يَفْعُلْنَ و تَفْعُلْنَ. وَ تَقُولُ: ـ يَرْمِي، يَرْمِيَانِ، يَرْمُونَ ـ تَرْمِي، تَرْمِيَانِ، يَرْمِينَ*تَرْمِي، تَرْمِيَانِ، تَرْمُونَ ـ تَرمِينَ، تَرْمِيَانِ، تَرْمِينَ ـ أَرْمِي، نَرْمِي.**

---

دو واو له سەر وەزنی يفعلون.وَيَغْزُونَ بـو جـمعی مؤنثی غـائب تـقديره كەیيَغْزُونَ يه به يەک واو كه لام‌الفعل له سەر وەزنی يَفْعُلْنَ.

هەروا جمعی مذكری مخاطب وه جمعی مـؤنثی مـخاطب، وه واوی لام‌الفعل له جمعه مذكره كانا حذف كراوه، وه له جمعه مؤنثه كانا ماوەتەوه، وەكو مصنف فەرموی: ـ«**فَوَزْنُ جَمْعُ الْمُذَكَّرِ: يَـفْعُونَ وَ تَـفْعُونَ**» بـه حەذفی لام‌الفعل.«**وَ وَزْنُ جَمْعِ الْمُؤَنَّثِ: يَفْعُلْنَ و تَـفْعُلْنَ.**» وه وەزنـی جمعی مؤنثی غائب يفعلن يه به اثباتی لام‌الفعل، وه وزنی جمعی مؤنثی مخاطب تَفْعُلْنَ به اثباتی لام‌الفعل.

«**وَ تَقُولُ:**»

تۆ ئەڵێیت: ـله مضارعی معتل‌اللامی بابی ثانیدا، «**يَرْمِي**» بۆ مفردی مذكری غائب، ئەصڵه كەی يرمِيُ بوو، وەكو: يضرب به ضمەی لام‌الفعل، بەڵام ضمه لەسەر یێ ثقيل بوو حەذفمان كرد مايه وه يرمی به سكونی یێ.

«**يَرْمِيَانِ**» بۆ تثنيەی مذكری غائب، ئەصڵه كـەی يـرمی بـوو، ئـەلف ضميری فاعلی تثنيه بوو، ئيلحاقمان كرد له گەڵ نونی ئيعرابـدا وه ئـەلف باعثی فەتحەی ماقبلی بوو، ماقبله كه مان مفتوح كرد گەڕا به يَرْمِيَانِ.

«**يَرْمُونَ**» بۆ جمعی مذكری غائب، ئەصڵه كەی يَرْمِيُوْنَ بوو، وەكـو:

## وَ أَصْلُ يَرْمُونَ، يَرْمِيُونَ فَفُعِلَ بِهِ مٰا فُعِلَ بِرَضُوا

يضربون ضمه لەسەر یێ ثقیل بوو نقلْمان كرد بۆلای ماقبلەكەی وه حەذفی یێ کەشمان کرد لە بەر التقاءالساكنين لە بەینی ئەو و ضمیری فاعله كه داگەڕا بە يَرْمُونَ لە سەر وەزنی يَفْعُونَ بە حەذفی لامالفعل.

«تَرْمِی» بۆ مفرد مؤنثی غائب. «تَرْمِیٰانِ» بۆ تشنیەی مؤنثی غائب، وەكو مفرد و تثنیەی مذكری غائب وان.

«يَرْمِينَ» بۆ جمعی مؤنثی غائب، بە اثبات لامالفعل.

«تَرْمِی» بۆ مفردی مذكری مخاطب. «تَرْمِيٰانِ» بۆ تشنیەی مذكری مخاطب. «تَرْمُونَ» بۆ جمعی مذكری مخاطب، دروست ئەكرێن وەكو مفرد و تثنیه و جمعی مذكری غائب.

«تَرْمِينَ» بۆ مفرد مؤنثی مخاطب، ئەصڵەكەی تَرْمِيِيْنَ بو، وەكو: تَضْرِبِينَ كسره لە سەر یێ ثقیل بوو حەذفمان كرد، وە حەذفی یێ کەیشمان كرد لە بەر دەفعی التقاءالساكنين، لە بەینی ئەو و ضمیری فاعلەكە داگەڕا بە تَرْمِيْنَ لە سەر وەزنی تَفْعِينَ.

«تَرْمِيٰانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب. «تَرْمِينَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب.وەكو تثنیه و جمعی مؤنثی غائب.

«أَرْمِی» بۆ متكلمی وحده. «نَرْمِی» بۆ متكلمی معالغير.

## وَ أَصْلُ يَرْمُونَ، يَرْمِيُونَ فَفُعِلَ بِهِ مٰا فُعِلَ بِرَضُوا

ئەصڵی يَرْمُوْنَ لە جمعی مذكری غائبدا، يَرْمِيُونَ بوو، وەكو يضربون ئیعلال كرا بە نقلی ضمەی لامالفعلەكەی، بۆلای ماقبلەكەی، وەكو

**وَ هٰكَذا حُكْمُ كُلٍّ ما كٰان مٰاقَبْلَ لٰامِهِ مَكْسُوراً: كَـيَهْدي، وَيُـنٰاجِي، وَيَرْتَجِي، وينبري، وَيَسْتَدْعِي، ويَرْعَوِي، وَيَغْرَوْرِي كَيَهْدي وَيُنٰاجِي يَرْتَجِي وَيَنْبَرِي ويَسْتَدْعِي**

---

ئیعلالی رضوا له جمعی مذکری غائبی ماضی دا له بابی رابع دا، که وتمان: ئەصڵه کەی رَضِيُوا بوو، وەکو: علموا نقڵی ضمەی لامالفعله که مان کرد بۆلای ماقبله کەی، وه حەذفی لامالفعله کـه یشـمان کـرد له بـەر دەفـعی التقاءالساکنین.

«**وَ هٰكَذا حُكْمُ كُلٍّ ما كٰان مٰاقَبْلَ لٰامِهِ مَكْسُوراً: كَيُهْدِي، وَيُنٰاجِي، وَيَرْتَجِي، وينبري، وَيَسْتَدْعِي، ويَرْعَوِي، وَيَغْرَوْرِي**» وەکو یرمی وایه له ئیعلالی لامالفعل دا، حوکمی هەر فعله مضارعێکی معتل‌اللام که ماقبلی فعله کەی مکسور بێ: -

«**كَيُهْدِي**»ئەصڵه کەی یُـهْدِیُ بـو بـه ضـمەی یـێ له مـضارعی بـابی افعال‌دا، ضمه به سەر یێ وه ثقیل بو لامان برد گەڕا به یُهْدِی «**وَيُنٰاجِي**»له مضارعی بابی مفاعلەدا، «**يَرْتَجِي**» له مضارعی بابی افتعال دا ئەصڵه کەی یرتجو بوو به واو، جا واو واقع له مرتبەی پێنجەمدا قەلبمان کرد به یێ، وه ضمه له سەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد گەڕا به یَرْتَجِی.«**وَيَنْبَرِي**» بۆ بابی انفعال.«**ويَسْتَدْعِي**» بۆ مضارعی بابی استفعال، ئەصڵه کەی یستدعو بوو به واو، جا واو واقع له مرتبه شەشەم دا قەلبمان کرد به یێ وه ضمه کەمان حەذف کرد گەڕا به یستدعی.

ويَرْعَوِي يَعْرَوْرِي وَ تَقُولُ: يَرْضٰى، يَرْضَيٰانِ، يَرْضَوْنَ ـ تَرْضٰى، تَرْضَيٰانِ، يَرْضَيْنَ* تَرْضٰى، تَرْضَيٰانِ، تَرْضَوْنَ ـ تَرْضَيْنَ، تَرْضَيٰانِ، تَرْضَيْنَ ـ أَرْضٰى، نَرْضٰى.

---

«ويَرْعَوِي» بۆ بابی افعلال ئەصڵە کەی یَرْعَوُوْ بوو بە دو واو جا واو واقع لە مرتبەی پێنجەما قەلبمان کرد بە یێ، وە ضمە کە مان حەذف کرد گەڕا بە یَرْعوِی.

«یَعْرَوْرِي» بۆ مضارعی بابی افعیلال ئەصڵە کەی یَعْرَوْرِوُ بوو، واو واقع لە مرتبەی شەشەم دا قەلبمان کرد بە یێ.وە ضمە کە مان حەذف کرد گەڕا بە یَعْرَوْرِی.

«وَ تَقُولُ:» تۆ ئەڵێیت لە مضارعی معتل اللامی بابی رابعا: ـ

«یَرْضٰی» بۆ مفردی مذکری غائب، ئەصڵە کەی یَرْضَوُ بوو وەکو: یعلم واو واقع لە مرتبە چوارەم دا قەلبمان کرد بە یێ، وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە یَرْضَیٰ.

«یَرْضَیٰانِ» بۆ تثنیەی مذکری غائب، ئەصڵە کەی یَرضَیٰ بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە لەگەڵ نونی ئیعراب دا، ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە یَرْضَیٰانِ.

«یَرْضَوْنَ» بۆ جەمعی مذکری غائب، ئەصڵە کەی یَرضَیُوْنَ بوو، وەکو یعلمون، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە یَرْضاوْنَ، جا ئەلفە کە مان حەذف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە یَرْضَوْنَ، لە سەر وەزنی یَفْعَوْنَ بە حەذفی لام‌الفعل.

«تَرْضیٰ» بۆ مفردی مؤنثی غائب «ئەصڵەکەی ترضو واو واقع لە پلەی چوارەما قەلبمان کرد بە یێ وە یێکسەمان کرد بە ئەلف گەڕا بە ترضیٰ.

...........................................................

«ترضیان» بۆ تثنیەی مفردی مؤنثی غائب بە هێشتنەوی یێ.

«یرضین» بۆ جەمعی مؤنثی غائب بە اثباتی یێ. «ترضی» بۆ مفردی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی ترضو بو قەلبی واوەکەمان کرد بە یێ ویێکەمان کرد بە ئەلف گەڕا بە ترضی.

«تَرْضیان» بۆ تثنیەی مذی مخاطب بە اثباتی ییکە «ترضون» بۆ جەمعی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی ترضیون بوو ضمە بە سەر یێوە ثقیل بو حەذفمان کرد التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و واوەکەدا حەذفی یێ کەمان کرد گەڕا بە ترضون.

«تَرْضَیْنَ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَرْضَی بوو، وەکو: تعلم یێ ضمیری فاعلی مؤنثی مخاطب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە لەگەڵ نونی ئیعراب داگەڕا بە تَرْضَیِینَ، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە ترضاین، جا حەذفی ئەلفەکەمان کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین، لە بەینی ئەلف و یێ کەداگەڕا بە تَرْضَیْنَ لە سەر وەزنی تَفْعَیْنَ.

«تَرْضَیانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب.

«تَرْضَیْنَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب ئەصڵەکەی تَرْضَیِیْنَ بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنثی بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە جالە بەر ئەوە ئەم نونە ضمیری جمع بوو، وە یێی مفرەدەکە ضمیری مفرد بوو، وە ئەم نونە فعلەکەی ئەکرد بە مبنی، وە نونی مفردەکە عەلامەتی ئیعراب بوو ئەم نونە بوبە باعثی حەذفی یێ وە نونی مفرەدەکە، وە لە بەر ئەوە باعثی سکونی ماقبلی بوو لام‌الفعلەکەمان ئیعادەکردە وە بە ساکنی، گەڕا بە تَرْضَیْنَ لە سەر وەزنی تَفْعَلْنَ.

«أَرْضی» بۆ متکلمی وحدە، وە «نَرْضی» بۆ متکلمی مع‌الغیر ئیعلال ئەکرێن وەکو: یَرْضی بە اثباتی لام‌الفعل.

**وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ كُلٍّ مٰا كٰانَ مٰاقَبْلَ لاٰمِهِ مَفْتُوحاً، نحو: يَتَمَطّیٰ، وَيَتَصٰابٰی، وَيَتَقَلْسٰی. فَلَفْظُ الْوٰاحِدَةِ الْمُؤَنَّثَةِ فِيالْخِطٰابِ كَلَفْظِ الْجَمْعِ فِي بٰابَيْ: يَرْمِي، يَرْضٰی والتَّقديرُ مُخْتَلِفٌ، فَوَزْنُ الْوٰاحِدَةِ:**

---

«وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ كُلٍّ مٰا كٰانَ مٰاقَبْلَ لاٰمِهِ مَفْتُوحاً، وەکو یرضی وایە لە ئیعلالا هەر معتل‌اللامیٚ کە ماقبلی لام‌الفعلە کـە مـفتوح بـیٚ تـیایا.وەکـو: «يَتَمَطّیٰ» بۆ مضارعی بابی تفعّل یتمطّوٌ بوو، واو واقع بوو لە پلەی پیٚنجەما قەلبمان کرد بە یێ وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يَتَمَطّی ئە خویٚنریتە وە بە ئەلف ئەنوسریٚ بە یێ.

«يَتَصٰابٰی» بۆ مضارعی بابی تفاعل، ئەصڵە کەی یتصابو، واو واقع لە پلەی پیٚنجەم دا قەلبمان کرد بە یێ وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يَتَصٰابٰی.

«يَتَقَلْسٰی» بۆ مضارعی بابی تَفَعْلُلْ، ئەصڵە کەی يَتَقَلْسَوْ بوو، واو واقع لە پلەی پیٚنجە ماقلبمان کرد بە یێ وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە يَتَقَلْسٰی.

«فَلَفْظُ الْوٰاحِدَةِ الْمُؤَنَّثَةِ فِيالْخِطٰابِ كَلَفْظِ الْجَمْعِ فِي بٰابَيْ: يَرْمِي و يَرْضٰی» واتە: دەرکەوت لەو ئیعلالانەوە کە کران ئەمە کە: لفظی مفردی مؤنثی مـخاطب وەکـو لـفظی جـمعی مـؤنثی مـخاطبە لە هـەر مـضارعە معتل‌اللامیٚک دا کە ماقبلی لام‌الفعلە کەی مکسور بیٚ.وەکو یرمی یا خود مفتوح بیٚ وەکو یرضی.«والتَّقديرُ مُخْتَلِفٌ، فَوَزْنُ الْوٰاحِـدَةِ: تَـفْعِينَ و

تَفْعِينَ و تَفْعَيْنَ. وَ وَزْنُ الْجَمْعِ تَفْعِلْنَ و تَفْعَلْنَ وَالأَمْرُ: مِنْهَا: أُغْزُ، أُغْزُوَا، أُغْزُوا۔ أُغْزِي، أُغْزُوَا، أُغْزُونَ.وَارْمِ، اِرْمِيَا، اِرْمُوا ۔ اِرْمِي، اِرْمِيَا، اِرْمِينَ.وَارْضَ، اِرْضَيَا، اِرْضَوْا ۔ اِرْضَيْ، اِرْضَيَا، اِرْضَيْنَ.

---

تَفْعَيْنَ.» بە لاّم لە تقدیرا جیان لە یەک، ئیستە وەزنی مفرەدی مؤنثی مخاطب لە بابی یرمی دا کە مضارعی مکسور العینە تَفْعِينَ یە، بە کسرەی عین‌الفعل وە حەذفی لام‌الفعل.وە لە بابی یرضی دا کە مضارعی مفتوح‌العینە تَفْعَين یە، بە فتحەی عین‌الفعل وە حەذفی لام‌الفعل.

«وَ وَزْنُ الْجَمْعِ تَفْعِلْنَ و تَفْعَلْنَ» وە وەزنی جمعی مؤنثی مخاطب لە بابی یرمی‌دا کە مکسورالعینە تَفْعِلْنَ‌یە بە کسرەی عین‌الفعل وە اثباتی لام‌الفعل.وە لە بابی یرضی دا کە مفتوح‌العینە تفعلن بە فتحە عین‌الفعل و اثباتی لام‌الفعل. ئەمری بە صیغە لەم بابانا: ۔

«أُغْزُ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَغْزُوْ بوو حەذفی حەرفی مضارعمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مضمومە وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی لام‌الفعل گەڕا بە أُغْزُ.

«أُغْزُوَا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَغْزُوَانِ بوو، حەذفی حەرفی مضارعمان کرد، وە هاتین بە همزەی وەصڵی مضمومە لە ئەوەڵیە وە، وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە أُغْزُوَا.

«أُغْزُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی تَغْزُوْنَ بوو، تێ حەرفی مضارع بۆ حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مضمومە، وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە

.........................................

أُغْزُوا، ضمه لەسەر واو ثقیل بو حەذفمان کرد، وه واوه که یشمان حەذف کرد له بەر التقاءالساکنین گەڕا به أُغزوا، له سەر وەزنی أُفْعُوا به ضمەی عین وه حەذفی لام.

«أُغْزِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی تَغْزُوِينَ بو، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وه هاتین له ئەوەڵیه وه به همزەی وەصڵی مضمومه، وه ئاخری مجزوم کرا به حەذفی نون گەڕا به أغزوی وەکو أنصری، جاکسره له سەر واو ثقیل بوو نقڵمان کرد بولای ماقبله کەی وه حەذفی واوه که مان کرد له بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا به أُغْزِي له سەر وەزنی أُفْعِي به کسرەی عین وه حەذفی لام.

«أُغْزُوا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، وه ئیعلاله کەی وەکو وتمان.

«أُغْزُونَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی تَغْزُونَ بوو، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وه هاتین به همزەی وەصڵی مضمومه له ئەوەڵیه وه، وه اثباتی نونه که مان کرد له بەر ئەوه ضمیری فاعل بوو گەڕا به أغزون له سەر وەزنی أُفْعُلْنَ وەکو أُنْصُرْنَ.

«اِرْمِ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، مشتقه له ترمی تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد وه هاتین له ئەوەڵیه وه به همزەی وەصڵی مکسوره، وه ئاخره کەمان مجزوم کرد به حەذفی لامالفعل گەڕا به اِرْمِ.

«اِرْمِيا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، مشتقه له ترمیان تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وه هاتین له ئەوەڵیه وه به همزه وەصڵی

..........................................

مکسورە، وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِرْمِیا.

«اِرْمُوا» بۆ جمعی مذکری مخاطب، مشتقە لە تَرْمِیُونَ تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مکسورە، وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِرْمِیُو لەسەر وەزنی اضربوا، جا ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو نقڵمان کرد بولای ماقبلە کەی وە یێ کە مان حەذف کدر لەبەر التقاءالساکنین گەڕا بە اِرْمُوا لە سەر وەزنی اِفْعُوا.

«اِرْمِی» بو مفردی مؤنثی مخاطب، مشتقە لە ترمین تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیەوە بە همزەی وەصڵی مکسورە، وە ئاخرەمان مجزوم کرد بە حەذفی نون گەڕا بە اِرْمی.

«اِرْمِیا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب مشتقە لە ترمیان وەکو بە یانمان کرد.

«اِرْمِینَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، مشتقە لە ترمین، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مکسورە، وە ئاخرە کەی مایە وە بە حاڵی خۆی لە بەر ئەوە دروست نیە حەذفی ضمیری فاعل بکرێ گەڕا بە اِرْمِینَ.

«وَارْضَ» بۆ مفردی مذکری مخاطب مشتقە لە تَرْضی، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد وەهاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مکسورە، وە ئاخرە کەمان مجزوم کرد بە حەذفی لام‌الفعل گەڕا بە اِرْضَ

«ارْضَیا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب مشتقە لە تَرْضَیانِ، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی

**وَإِذا أُدْخِلَتْ عَلَيْهِ نُونُ التَّأْكِيدِ أُعِيدَتِ اللاَّمُ الْمَحْذُوفَةُ فَقُلْتَ: أُغْزُوَنَّ، أُغْزُوانِّ، اِرْمِيَنَّ، وَارْضَيَنَّ**

---

مكسوره وه ئاخره كه‌مان مجزوم كرد به حه‌ذفی نون گه‌را به اِرْضَیا.

«اِرْضَوْا» بۆ جمعی مذكری مخاطب، مشتقه له تَرْضَوْنَ، تیٰ حه‌رفی مضارع بوو، حه‌ذفمان كرد، وه هاتین له ئه‌وه‌ڵیه وه به هـمزه‌ی وه‌صڵی مكسوره، وه ئاخره كه‌مان مجزوم كرد به حه‌ذفی نون گه‌را به اِرْضَوْا.

«اِرْضَيْ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، مشتقه له تَرْضَيْنَ، تیٰ حـه‌رفی مضارع بوو حه‌ذفمان كـرد، وه هـاتین له ئـه‌وه‌ڵیه‌وه بـه هـمزه‌ی وه‌صڵی مكسوره، وه ئاخره كه‌مان مجزوم كرد به حه‌ذفی نون گه‌را به اِرْضَيْ.

«اِرْضَيا» بۆ تثنیه‌ی مؤنثی مخاطب، مشتقه له ترضیان، تیٰ حـه‌رفی مضارع بوو حه‌ذفمان كرد، وه هـاتین له ئـه‌وه‌ڵیه وه بـه هـمزه‌ی وه‌صڵی مكسوره، وه ئاخره كه‌مان مجزوم كرد به حه‌ذفی نون گه‌را به اِرْضَیا.

«اِرْضَيْنَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، مشتقه له تَرْضَيْنَ، تیٰ حـه‌رفی مـضارع بـوو حـه‌ذفمان كـرد، هـاتین له ئـه‌وه‌ڵیه وه بـه هـمزه‌ی وه‌صڵی مكسوره، وه ئاخره كه‌مان هێشته وه گه‌را به اِرْضَيْنَ.

«**وَإِذا أُدْخِلَتْ عَلَيْهِ نُونُ التَّأْكِيدِ أُعِيدَتِ اللاَّمُ الْـمَحْذُوفَةُ**» كـاتیٰ نونی تأكیدی خفیفه یا ثقیله لاحق كـرابـه‌م ئـه‌مری بـه صیغه وه، وه یـا مضارعی مجزوم به حه‌ذفی لام‌الفعل، ئه وه ئه‌و لام‌الفعله كه حه‌ذف كراوه له‌به‌ر قاعده ئیعاده ئه‌كرێته‌وه به مـفتوحی «**فَـقُلْتَ: أُغْـزُوَنَّ، أُغْـزُوانِّ، اِرْمِيَنَّ، وَارْضَيَنَّ**» ئه‌صڵه كه یان أغز، ارم ارض بوو به حه‌ذفی لام‌الفعل مؤكدمان كردن به بونی تاكیده وه، جا لام‌الفعله محذوفه كه‌مان هێنایه وه به

وَاسْمُ الْفاعِلِ مِنْها: ـ غازٍ، غـازِيانِ، غـازُونَ ـ غـازِيَةٌ، غـازِيَتانِ، غازِياتٌ وَ غَوازٍ.وَ كَذالِكَ: رامٍ و راضٍ وَ أَصْلُ غازٍ: غازِوٌ فَقُلِبَتِ الْواوُ ياءً لِتَطَرُّفِها وِانْكِسارِ ماقَبْلَها كَما قُلِبَتْ فِي غُزِيَ، ثُـمَّ قـالُوا: غازِيَةٌ لِأَنَّ الْمُؤَنَّثَ فَرْعُ الْمُذَكَّرِ وَالتّاءُ طارِيَةٌ.

---

مفتوحی به هۆی نونی تأكیده وه گەڕان به: اغزوَنَّ، ارميَنَّ، ارضيَنَّ.

«وَاسْمُ الْفاعِلِ مِنْها:

اسمی فاعل لەم بابانا

«غازٍ» بۆ مفردی مذكری غائب، ئەصڵی غازٍ غازِوٌ بوو جا واو متطرف ماقبل مكسور قەلب كرابە یێ وەكو واوی غُزِوَله صیغەی بنامفعولی فعلی ماضی داكراوه به یێ له سەر قاعدەی دامه زراو: ضمه له سەر یێ ثقیل بوو حەذفمان كرد وه التقاءالساكنین ڕوی داله بەینی یێ و تنوین دا حەزفی یێ کەمان کرد گەڕا به غازٍ.

«غازِيانِ» بۆ تثنیەی مذكری غائب، ئـەصڵە كـەی غـازوان بـوو، واو متطرف ماقبل مكسور قەلبمان كرد به یێ گەڕا به غازیان بۆ تثنیه له حاڵەتی رەفعەدا.

«غازُونَ» بۆ جمعی مذكری له حاڵەتی رەفعەدا، ئەصڵە كەی غازیون بوو، ضمه له سـەر یـێ ثقیل بـوو نـقڵمان كـرد بـۆلای مـاقبله كـەی، وه التقاءالساكنین ڕوی دا له بەینی یێ و واوی جمعه كەدا، حەذفی یێ كه مان كرد گەڕا به غازون.

«غازِيَةٌ» بۆ مفردی مؤنث ئـەصڵە كـەی غـازِوَةٌ بـوو بـه واو جـا واو

..........

متطرف ماقبل مكسور قەلبمان كرد بە يێ گەڕا بە غازية.

«غٰازِيَتٰانِ» بۆ تثنيەی مؤنث، ئەصڵە كەی غازوتان بـوو، قـەلبی واوە كەمان كرد بە يێ گەڕا یە غازيتان.

«غٰازِيٰاتٌ» بۆ جمعی مؤنثی سالم ئەصڵە كەی غازوات بـوو، قـەلبی واوە كەمان كرد بە يێ گەڕا بە غازيات.

و «غَوٰازٍ» بۆ جـمعی مـؤنثی مكسـر، ئـەصڵە كـەی غَـوازِوٌ بـوو، واو متطرف ماقبل مكسور قەلبمان كرد بە يێ گەڕا بە غَوازِيٌ بە ضمە و تنوين جا ضمە لە سەر يێ ثقيل بوو حەذفمان كرد، وە حەذفی يێ كەيشمان كرد لە بەر دەفعی التقاءالساكنين لە بەينی يێ و تنوينە كەدا گەڕا بە غَوٰازٍ.

وە حوكمی رٰامٍ وە راضٍ وەكو: غازٍ وايە لە ئيعلالا، وە ئەصڵی رام، رامِيٌ بوو ضمە لە سەر يێ ثقيل بوو حەذفمان كرد وە حەذفی يێ كەيشمان كرد لە بەر دەفعی التقاءالساكنين لە بەينی ئەو و تنوينە كـەدا گـەڕا بـە رامٍ، وە ئەصڵی راضِ رٰاضِوٌ بوو واو متطرف ماقبل مكسور قەلبمان كرد بە يێ گەڕا بە رٰاضِيٌ، جا ئيعلالمان كرد وەكو: رام گەڕا بە رٰاضٍ جالە بەر ئەوە پرسيار كراوە لە سڕّی قەلبی واو بە يێ لە وێنەی غازية كە ئەصڵە كەی غازوةٌ بوە مع انە واوە كە لە طرفە وە نەبوە!مصنف فـەرموی: «ثُـمَّ قـٰالُوا غـٰازِيَةٌ لِأَنَّ الْمُؤَنَّثَ فَرْعُ الْمُذَكَّرِ وَالتّٰاءُ طٰارِيَةٌ» واتە پاش ئەو باسانە بزانن كە عـەرەب خوێندويانە تەوە غازية، بە قەلبی واو بە يێ مع انە واوە كە لە طرەفە وە نيە

**وَتَقُولُ فِی اسْمِ الْمَفْعُولِ مِنَ الْواوِیِّ مَغْزُوٌّ وَ مِنَ الْیائِیِّ، مَرْمِیٌّ بِقَلْبِ الْواوِ یاءً وَ کَسْرِ ماقَبْلَها**

لەبەر ئەوەکە مؤنث فەرعی مذکرە مادام لە مذاکرا واوەکەمان لە طرەفەوەیە، لە مؤنثیش دا قەلبی ئەو واوەیان کرد بە یێ، وە لە بەر ئەوەیش مادام تیی تأنیث عارض بوە بۆیە فەرقی مؤنث لە گەڵ مذکر دا کأنە هەر نیە لە ئارادا.

وە بە وێنەی ئەم جوابە جواب ئەدرێتە وە لە صیغەی تثنیە و جمع دا، مثلاً ئەڵێین: تثنیە و جمع فرعی مفردن مادام لە وا ئیعلال کراوە لە میشدا ئەکرێ.وە یا خود ئەڵێین: ـ ئەم عەلامە تانە مادام عارضن کأنە لە لفظە کانانین، وە واوەکە یان وا لە طرفە وە.

«وَتَقُولُ فِی اسْمِ الْمَفْعُولِ مِنَ الْواوِیِّ مَغْزُوٌّ» تۆ ئەڵێیت: ـ لە اسمی مفعولی معتل اللامی ثلاثی مجردی واوی دا مغزوٌّ ئەصڵەکەی مَغْزُوْوٌ بوو، واوی ئەوەڵمان دەغم کرد لە ثانی داگەڕا بە مَغْزُوٌّ.

«وَ مِنَ الْیائِیِّ، مَرْمِیٌّ بِقَلْبِ الْواوِ یاءً وَ کَسْرِ ماقَبْلَها» وە تۆ ئەڵێیت: ـ لە اسمی مفعولی معتل اللامی یائی دا: ـ مَرْمِیٌّ بە قەلبی واوی اسمە مفعولەکە بە یێ، وە مکسور کردنی ماقبلەکەی، چونکی ئەصڵی مرمی مَرْمُوْیٌ بوو، قەلبی واوەکەمان کرد بە یێ وە یێمان لە یێ دا دەغم کرد وە

لأَنَّ الْواوَ وَالْياءَ إِذا اجْتَمَعَتا فِي كَلِمَةٍ واحِدَةٍ وَالأُولى مِنْهُما ساكِنَةٌ تُقْلَبُ الْواوُ ياءاً، وَ أُدْغِمَتِ الْياءُ فِي الْياءِ وَ تَقُولُ فِي فَعُولٍ مِنَ الْواوِيِّ: عَدُوٌّ وَ مِنَ الْيائِيِّ: بَغِيٌّ وَ فِي فَعِيلٍ مِنَ الْواوِيِّ: صَبِيٌّ.وَ مِنَ الْيائِيِّ: شَرِيٌّ.

---

ماقبلی یێ کەمان مکسور کرد گەڕا بە مَرْمِيٌّ.«لأَنَّ الْواوَ وَالْياءَ إِذا اجْتَمَعَتا فِي كَلِمَةٍ واحِدَةٍ وَالأُولى مِنْهُما ساكِنَةٌ تُقْلَبُ الْواوُ ياءاً، وَ أُدْغِمَتِ الْياءُ فِي الْياءِ».

ئەڵیی: لە بەر ئەوەکە واو وە یێ کاتێ گرد بوونە وەلە یەک کلمە دا، وە یەکە میان ساکن بوو قەلبی واوە کە ئەکرێ بە یێ، وە یێ لە یێدا دەغم ئەکرێ، وە لە بەر مناسبەی یێ کە ماقبلە کەیشی مکسور ئەکرێ، وەکو بەیانمان کرد.

«وَ تَقُولُ فِي فَعُولٍ مِنَ الْواوِيِّ: عَدُوٌّ وَ مِنَ الْيائِيِّ: بَغِيٌّ» تۆ ئەڵێت لە بنای صیغەی فعول لە معتل اللامی واوی دا عَدُوٌّ بە تشدیدی واو ئەصڵەکەی عدوو بوو بە دوو واو جا واومان لە واودا دەغم کرد بوبە عَدُوٌّ.

وە لە معتل اللامی یائی دا بَغِيٌّ ئەصڵە کەی بَغُويٌ بوو، واو وە یێ گرد بوونە وە لە کلمە یەکدا ئەوەڵیان ساکن بوو قەلبی واوەکەمان کرد بە یێ ویێمان لە یێدا غم کردوە ماقبلی یێ کەمان مکسور کرد گەڕا بە بَغِيٌّ.

«وَ فِي فَعِيلٍ مِنَ الْواوِيِّ: صَبِيٌّ.وَ مِنَ الْيائِيِّ: شَرِيٌّ.»

تۆ ئەڵێیت: لە بنای فعیلی معتل اللامی واوی دا صبیٌّ وە شریٌّ، ئەصڵی صَبِيٌّ صَبِيوٌ بوو، واو وە یێ گرد بونە وە قەلبی واوە کەمان کرد بە یێ، یێمان لە یێدا دەغم کرد گەڕا بە صَبِيٌّ.وە ئەصڵی شِرِيٌّ. شَرِيٌّ بوو دغمی یێ ئەوەڵمان کرد لە یێ ثانی دا گەڕا بە شریٌّ

**وَالثُّلاثِيُّ الْمَزِيدُ فِيهِ تُقْلَبُ واوُهُ ياءاً. لأنَّ كلَّ واو وقعت رابعةً فصاعداً ولم يكن ماقبلها مضموماً قلبت ياءاً فَتَقُولُ أَعْطىٰ يُعْطِي، وَاعْتَدىٰ يَعْتَدِي، وَاسْتَرْشىٰ يَسْتَرْشِي.**

---

«**وَالثُّلاثِيُّ الْمَزِيدُ فِيهِ تُقْلَبُ واوُهُ ياءاً.**» واتە: هەر فعلێ وە هەر ئیسمێکی ثلاثی مزید فیه معتل‌اللام ئەوە واوە لام‌الفعلە کەی قلب ئەکرێ بە یێ.«**لأنَّ كلَّ واو وقعت رابعةً فصاعداً ولم يكن ماقبلها مضموماً قلبت ياءاً**» چونکی هەر واوێ لە پایەی چوارەم یا زیاتر دا بێ، وە ماقبلەکەی مضموم نە بێ، ئەوە قلب ئەکرێ بە یێ لە بەر تخفیف.

«**فَتَقُولُ أَعْطىٰ يُعْطِي، وَاعْتَدىٰ يَعْتَدِي، وَاسْتَرْشىٰ يَسْتَرْشِي.**»

ئیستە أعطی فعلی ماضی بابی افعال وە یعطی مضارعیە تی وە لام‌الفعلە کە یان واوە، قەلبی واوە کەمان کرد وە بە یێ وە ئەو یێ لە ماضی یە کەدا قەلب کراوە بە ئەلف، وەلە مضارعە کەدا ماوە تە وە بە لام ضمە کەی حذف کراوە لە بەر تخفیف.

وە اعتدی ماضی بابی افتعال وە یعتدی مضارعیە تی وە لام‌الفعلە کە یان واوە، لە بەر ئەوە والە مرتبەی چوارە ماقەلب کرابە یێ. بەلام لە ماضی یە کەیدا یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلب کراوە بە ئەلف، وە لە مضارعە کە داماوەتەوە، بەلام لەبەر ئەوە ضمە لەسەر یێ ثقیل بووە حەذفی ضمە کەی کراوە بوە بە یَعْتَدِی.

وە ئەلێت: لە ماضی و مضارعی بابی استفعال دا استرشی یسترشی ئەصلە کە یان إِسْتَرْشَو وە يَسْتَرْشِوُ بوو (واو واقع لە مرتبەی شەشەما

وَ تَقُولُ مَعَ الضَّمِيرِ أَعْطَيْتُ وَاعتَدَيْتُ واسْتَرْشَيْتُ وَ كَذٰلِكَ: تَغٰازَيْنٰا وَ تَرٰاجَيْنٰا

---

قەلب کرا بە یێ بەڵام لە ماضی یەکەدا یێ متحرک ماقبل مفتوح قلب کراوە بە الف وە لە مضارعەکەدا یێ کە ماوە تە وە، جالە بەر ئەوە ضمە لە سەر یێ ثقیلە حەذف کراوە و گەڕاوە بە یَسْتَرْشِی.

«وَ تَقُولُ مَعَ الضَّمِيرِ أَعْطَيْتُ وَاعتَدَيْتُ واسْتَرْشَيْتُ» تۆ ئەڵێیت لە کاتی ئیلحاقی ضمیری مرفوعی متحرکی متکلم بە و فعلە ماضی یانە وە اعطیت و اعتدیت و استرشیت بە قەلبی واوەکەیان بە یێ بە پێ‌ی ئەو قاعدە دامەرزاوەی ڕابوردو.

«وَ كَذٰلِكَ: تَغٰازَيْنٰا وَ تَرٰاجَيْنٰا» هەر وا واوە کانیان قەلب ئەکرێن بە یێ کاتێ ئیلحاقی ضمیری متکلمی مع‌الغیر بە ئاخری ماضی یەکانە وە، وەکو: تغازینا وە تراجینا.کە ئەصڵەکەیان تغازونا وە تراجونا بوە بە واو، بەڵام واوە کانمان بە قاعدەی پێشو قەلب کرد وە بە یێ، وە بوون بە تغازَیْنٰا وە تراجَیْنٰا.

## النَّوْعُ الرَّابِعُ: اَلْمُعْتَلُّ الْعَيْنُ وَ اللاَّمُ

وَ يُقَالُ لَهُ اللَّفِيفُ الْمَقْرُونُ فتقول: شَوٰى، يَشْوِى، شَيّاً، مِثْلُ: رَمٰى يَرْمِى رَمْياً وَ قَوِىَ، يَقْوٰى، قُوَّةً، وَرَوِىَ، يَرْوٰى، رَّياً.مِثْلُ: رَضِىَ، يَرْضٰى، رَضٰياً

---

«وَ يُقَالُ لَهُ اللَّفِيفُ الْمَقْرُونُ» نەوعی چوارەم لە حەوت نەوعی معتل فعلێ یا ئیسمێکە عین‌الفعل و لام‌الفعلی حەرفی علله بن، وە ئەم نەوعە پێی ئەوترێ: ـ (لفیفی مقرون) چونکی دو حەرفی عللەی بە یەکەوە تیا پیچراوە تەوە.

«فتقول: شَوٰى، يَشْوِى، شَيّاً، مِثْلُ: رَمٰى يَرْمِى رَمْياً» یانی حوکمی لفیفی مقرونی بابی ثانی وەکو ناقصی ئەو بابە وایە لە ئیعلال‌دا.

ئەصڵی شوی، شَوَىَ بوو بە فتحەی یێ، یـێ متحرک مـاقبل مـفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف.وە ئەصڵی یشوی یَشْوِىُ. بە ضمەی یێ ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حذفمان کرد گەڕا بە یشوی وە ئەصڵی شَيّاً شَوْياً بوو، واو وە یێ گرد بوونە وە لە یەک کلمە دا، قەلبی واوە کەمان کرد بە یێ، وە یێ مان لە یێ دا دەغم کرد گەڕا بە شَيّاً.

«وَ قَوِىَ، يَقْوٰى، قُوَّةً، وَرَوِىَ، يَرْوٰى، رَّياً.مِثْلُ: رَضِىَ، يَـرْضٰى، رَضْياً» یانی حوکمی لفیفی مقرونی بابی رابع کە لام‌الفعله کە یان واو بێ وەکو مثالی یـە کـەم یـاخۆیێ بـێ وەکـو مـثالی دوهـەم، وەکـو حـوکمی معتل‌اللامی بابی رابع وایە لە ئیعلال دا.

# فَهُوَ رَيَّانٌ وَامْرَئَةٌ رَيَّى مِثْلُ: عَطْشَانَ وَ عَطْشَى، وَأَرْوٰى كَأَعْطَى

ئەصڵی قَوِیَ قَوِوَ بوو بە دو واو.واو متطرف ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە قَوِیَ.وە ئەصڵی یَقْوٰی یَقْوَوُ بوو، وەکو یعلم، واو واقع لە مرتبەی چوارە ماقەبلمان کرد بە یێ گەڕا بە یَقْوٰی.وە ئەصڵی قُوَّةً، قُوْوً بوو بە دو واو، دەغمی واوی ئەوەڵمان کرد لە واوی ثانی داگەڕا بە قوَّة.

وە ئەصڵی یَرْوٰی، یَرْوَیُ بوو بە ضمەی لام‌الفعل، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە یَرْوٰی وە ئەصڵی رَیًّا، رَوْیاً بوو قەلبی واوە کە مان کرد بە یێ، وە دەغمی یێ مان کرد لە یێدا گەڕا بە رَیًّا.

«فَهُوَ رَیَّانٌ» بۆ صیغەی مشبهەی مفردی مذکر لە سەر وەزنی فَعْلان لەم بابا، ئەصڵەکەی رَوْیان بوو، واو وە یێ گرد بوونە وە لە کلمە یەکدا قەلبی واومان کرد بە یێ، وە یێ مان لە یێدا دەغم کرد گەڕا بە رَیَّان.

«وَامْرَئَةٌ رَیِیٌّ» ئەو تریێ بۆ مفردی مؤنث لە صیفەتی مشبهەی ئەم بابا، رَیّیٰ بە تشدیدی یێ ئەصڵەکەی رَوْیا بوو لەسەر وەزنی فَعْلی وەکو: سَکْریٰ قەلبی واوەکەمان کرد بە یێ، وە دەغمی یێ‌مان کرد لە یێداگەڕا بە ریّیٰ

«مِثْلُ: عَطْشَانَ وَ عَطْشَی، وَأَرْوٰى كَأَعْطَى» واتە: ـ ریّان بۆ مفردی مذکر وەکو عطشان.و ریّا بۆ مفردی مؤنث وەکو عَطْشی وایە، وە میزانی ئەوەڵ فعلان وە میزانی ثانی فَعْلی‌یە.وأَرْوٰى كَأَعْطٰى یانی حوکمی لفیفی مقرونی بابی افعال، وەکو معتل‌اللامی ئەو بابە وایە، ئەصڵی أَرْوٰی، أَرْوَیُ بوو، وەکو أکرم یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە أَرْوٰی.

**وَحَيِيَ مِثْلُ: رَضِيَ يَحْيٰى، حَيٰوةً وَ تُكْتَبُ بِصُورَةِ الْوٰاوِ فَهُوَ حَيٌّ وَحَيَّا وَ حَيِيَا فهما حَيَّانِ وحَيُّوا وحَيِيُوا**

«وَحَيِيَ مِثْلُ: رَضِيَ» یانی حوکمی ماضی بابی رابع له لفیفی مقرونا، وەکو ماضی بابی رابع وایه له معتل‌اللّاما جا ئەتوانی بیخوێنێته وه به ادغامی عین‌الفعل له لام‌الفعل دا وه بلێیت: حيَّ له بەر دەفعی اجتماع المثلين.

«يَحْيٰى، حَيٰوةً» يَحْيٰى بۆ مضارعه کەی به فەککی ادغام، ئەصڵەکەی يَحْيَيُ وەکو يعلم بوو به ضمەی یێ ثانی یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد به ئەلف گەڕا به يَحْيٰى ـ حَيٰوةً له مصدەر دا ئەصڵەکەی حَيَيَةٌ بوو به دو یێی مفتوحه وەکو غَلَبَةً، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبی یێ ثانیمان کرد به ئەلف، گەڕا به حَيٰوةً ئه خوێنرێته وه به ئەلف «وَ تُكْتَبُ بِصُورَةِ الْوٰاوِ» وه ئەم ئەلفه به سورەتی واو ئەنوسرێ له سەر یاسای خوێندنه وەی به واو له سەر بازی لوغەت له ناو عەرەبا.

«فَهُوَ حَيٌّ» ئەڵێی بۆ صفەتی مشبهەی حَيٌّ به تشدیدی یێ وه فتحەی فاءالفعله که له مفردی مذکرا.

«وَحَيَّا وَ حَيِيَا فهما حَيَّانِ» وه ئه توانی تثنیەی مذکری غائبی ئەم بابه بخوێنێته وه به ادغام وه به فەککی ئدغام له ماضی دا..

وه ئه مما صیفەتی مشبهەی مثنی ئەوه هەر به دەغمه وه ئه خوێنرێته وه، وەکو حَيّان.«وحَيُّوا» بۆ جمعی مذکری غائب له فعلی ماضیدا به ادغامه وه «وحَيِيُوا» به فەککی ادغام.

فَهُمْ أَحْيٰاءُ وَ يَجُوزُ حَيُوا بالتَّخفيفِ كَرَضُوا وَالأَمْرُ: اِحْيَ، كَاِرْضَ وَ أَحْيٰى يُحْيِي، كَأَعْطٰى يُعْطِي وَأَحْيٰى يُحيِي، كَأَعْطٰى يُعْطِي أَحْيٰاءاً وَحٰايٰا يُحٰايِي مُحٰايٰاةً

---

«فَهُمْ أَحْيٰاءُ» بۆ جمعی مذکری مکسری صیفەتی مشبهە ئەلێین: أحیاء لە سەر وەزنی اَفْعال.

«وَ يَجُوزُ حَيُوا بالتَّخفيفِ كَرَضُوا» دروستە خوێندنە وەی حَيُوا لە ماضی‌دابە تخفیف بە حەذفی یەکی لە یێ کان وەکو:
ئە خوێنرێتە وە رَضُوا بە نقلی ضمەی لام‌الفعلە کە بولای ماقبلە کەی، وە حەذفی خۆی.

«وَالأَمْرُ: اِحْيَ، كَاِرْضَ وَ أَحْيٰى يُحْيِي، كَأَعْطٰى يُعْطِي» واتە: بۆ ئەمری بە صیغەی مفردی مذکری مخاطب لەم بابە بلێ: اِحِيَ.وەکو اِرْضَ لە ئەمری بابی رابع لە مادەی رَضِيَ بە حەذفی لام‌الفعل.

«وَأَحْيٰى يُحيِي، كَأَعْطٰى يُعْطِي» بۆ ماضی و مضارعی بابی افعال لەم مادداا، وە ئەصلی أحیا أحیی بە دو یێ جا ئیعلال لام‌الفعلە کەمان کرد بە قەلبی بە ئەلف گەڕا بە أَحْيٰى.

وە ئەصلی یُحیِی یُحْيِيُ بوو بە ضمەی لام‌الفعلە کەی، ضمە لە سەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد گەڕا بە یُحْیِی.

«أِحْيٰاءاً» بۆ مصدەرە کەی ئەصلە کەی اِحیایاً بوو، وەکو اِعطاءً، یێ واقع لە پاش ئەلفی زائدە وە قەلبمان کرد بە همزە گەڕا بە اِحْيٰاءً.«وَحٰايٰا يُحٰايِي مُحٰايٰاةً» بۆ مضای و مضارع و مصدری بابی مفاعلە لە مادەی حَيِيَ، ئەصلی حایا حٰايَيَ بوو بە دو یێ، جا یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبی

اِسْتَحْيٰى يَسْتَحْيِي اِسْتِحْيٰاءً وِاسْتَحِي وَ مِنْهُمْ مَنْ يَحْذِفُ اِحْدَى الْيٰائَيْنِ وَ يَقُولُ: اِسْتَحٰى يَسْتَحِي اِسْتِحٰاءً

یێ کەمان کرد بە ئەلف گەڕا بە حٰایٰا.وە ئەصڵی محایاة مُحٰایَیَةٌ بوو، یێ متحرک ماقبل مفتوح قلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە مُحٰایٰاةً.

«اِسْتَحْيٰى يَسْتَحْيِي اِسْتِحْيٰاءً» بۆ ماضی و مضارع و مصدەری بابی استفعال لە مادەی حَيَّ.وە ئەصڵی اِسْتَحْيَيَ بوو، وەکو استخرج قەلبی یێی ثانیمان کرد بە ئەلف گەڕا استحییٰ، وە ئەصڵی یستحیی یستحییُ بوو وەکو یستخرج ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد گەڕا بە یَسْتَحْیِی.وە ئەصڵی استحیاء، استحیایاً بوو، یێی ئاخر واقع لە پاش ئەلفی زائدە وە قەلبمان کرد بە همزە گەڕا بە استحیاءً.

«وِاسْتَحْيِ» بۆ ئەمر بە صیغەی مفرەدی مذکری مخاطب لە مادەی حَيَّ لە بابی استفعالاً حاصڵ بووە، بە حەذفی حەرفی مضارع، وە جەلبی همزەی وەصڵی مکسورە، وە حەذفی لامالفعلە کەی.

«وَ مِنْهُمْ مَنْ يَحْذِفُ اِحْدَى الْـيٰائَيْنِ وَ يَـقُولُ: اِسْـتَحٰى يَسْـتَحِي اِسْتِحٰاءً» واتە: لە عەرەبە کانە کە سێ حەذفی یە کێ لەو دوو یێ کات لە مادەی حَيَّ وەیە کێکیان ئەهێڵێتە وە، وە ئـەڵێ اِسْـتَحٰا یَسْـتَحِی اِسْـتِحٰاءً، ئەصڵی اِسْتَحٰی اِسْتَحْیَیَ بوو بە دو یێ، حەذفی یەکێ لە یێ کانمان کرد، وە فاءالفعلە کەمان مفتوح کرد وە قەلبی یێ کـەمان کـرد بـە ئـەلف گـەڕا بـە اِسْتَحٰی، وە ئەصڵی یستحی یَسْتَحْیِیُ بوو، وەکو یستخرج یە کێ لەو دوو یێ مانە حەذف کرد، وە فاءالفعلە کە مان مکسور کرد جا ئەگەر محذوف

## اِسْتَحِ وَ ذٰلِکَ لِکَثْرَةِ الْإِسْتِعْمٰالِ کَمٰا قٰالُوا لٰاأَدْرِ فِی لٰاأَدْرِی

عین‌الفعله که بێ، ئەوه ضمه‌ی لام‌الفعله که‌یش حه‌ذف ئه کرێ، وه ئه‌گه‌ر محذوف لام‌الفعله که بێ، ئه وه کسره‌ی عین‌الفعله که‌یش حه‌ذف ئه‌کرێ وه ئه‌بێ به یَسْتَحِی.

«اِسْتَحِ» بۆ ئه‌مری به صیغه‌ی مفردی مذکری مخاطب، له‌م ئیستعمالا ئه‌صڵه که‌ی تَسْتَحِی بوو حه‌ذفی حه‌رفی مضارعمان کرد، وه هه‌مزه‌ی وه‌صڵی مکسوره‌مان هێناله ئه‌وه‌ڵیه وه، وه حه‌ذفی یێ که‌مان کرد له ئاخریه وه گه‌ڕا به اِسْتَحِ له سه‌ر وه‌زنی اِسْتَفِ به حه‌ذفی عین و لام یه‌کێ له تخفیفا وه یه‌کێ له بنای ئه‌مرا.

«وَ ذٰلِکَ لِکَثْرَةِ الْإِسْتِعْمٰالِ کَمٰا قٰالُوا لٰاأَدْرِ فِی لٰاأَدْرِی» واته: وه حه‌ذفی یه‌کێ له‌و دوو یێ یه له بابی استفعالی ماده‌ی حَیِیَ، له به‌ر فره ئیستعماله که باعثی ئه‌وه‌یه تخفیفی کلمه که بکرێ، وه‌کو ئه‌وه خوێندویانه ته‌وه لاأدر به حه‌ذفی یێی لام‌الفعل، له به‌ر تخفیف له جومله‌ی لاأدری دا...

# اَلنّوعُ الْخامِسُ: اَلْمُعْتَلُّ الْفاءُ واللّامُ

اَلنّوعُ الْخامِسُ: اَلْمُعْتَلُّ الْفاءُ واللّامُ وَ يُقالُ لَهُ اللَّفِيفُ الْمَفْرُوق فَتَقُولُ: وَقٰى، كَرَمٰى، يَقِى يَقِيٰانِ يَقُونَ

---

نەوعی پێنجەم لە حەوت نەوعەی معتل، عبارەتە لە مشتقێ کە معتل الفاو لام بێ. «وَ يُقالُ لَهُ اللَّفِيفُ الْمَفْرُوق فَتَقُولُ: وَقٰى، كَرَمٰى، يَقِى يَـقِيٰانِ يَقُونَ» وە بەم نەوعە ئەوترێ لفیفی مفروق چونکی دوو حەرفی عـللەی تێدا پێچراوە تەوە لە گەڵ فصل وە فەرق لە بەینی ئەوانا.وە حوکمی لفیفی مفروق لە بابی ثانی دا وەکو معتل اللامە کەی وایە.ئەصڵی وقی وَقَیَ بووە بە فتحەی یێ، جا یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە وَقٰى.

«يَقِى» بۆ مضارعە کەی ئەصڵە کەی يَوْقِيُ بوو، وەکو یضرب، واو واقع لە بەینی یێ و کسرە دا حەذفمان کرد، وە ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد لە ئاخریە وە گەڕا بە يَقِى لە سەر وەزنی يَعِلُ بە حەذفی فاءالفعل.

«يَقِيٰانِ» بۆ تثنیەی مذکری غائب ئەصڵە کەی یقی بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بوو لاحقمان کرد بە ئاخریە وە لە گەڵ نون ئیعرابدا، وە ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە یقیان.

«يَقُونَ» بۆ جمعی مذکری غائب، ئەصڵە کـەی یـقی بـوو، واو ضـمیر فاعلی جمعی مذکر بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە لە گەڵ نونی ئیعرابدا، وە لە بەینی واو و حەرفی یێ ساکنە کەدا التقاءالساکنین پـەیدا بـوو، جـا حەذفی یێ کە مان کرد، وە ماقبلە کەمان مضموم کرد، لەبەر مناسبەی واوە کە گەڕا بە يَقُوْنَ.

تَقِي تَقِيَانِ يَقِينَ تَقِي، تَقِيَانِ، تَقُونَ تَقِينَ تَقِيَانِ تَقِينَ
أَقِيْ نَقِي

«تَقِي» بۆ مفردی مؤنثی غائب دروست ئەکرێ وەکو یقی.

«تَقِيَانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی غائب دروست ئەکرێ وەکو یقیان.

«يَقِينَ» بۆ جمعی مؤنثی غائب بە زیاد کردنی نونی ضمیری فاعلی جمعی مؤنث. «تَقِي، تَقِيَانِ، تَقُونَ» بۆ مفرد و تثنیە و جمعی مذکری مخاطب، دروست ئەکرێن وەکو: مفرد و تثنیە و جمعی مذکری غائب.

«تَقِينَ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تَقی بوو، یێ ضمیری فاعلی مؤنثی مخاطب بوو ئیلحقمان کرد بە ئاخریە وە لەگەڵ نونی ئیعرابدا، جا حەذفی یێ لام‌الفعلەکەمان کرد، لە بەر دەفعی التقاءالساکنین لە بەینی ئەو و یێ ضمیرەکەدا گەڕا بە تَقِينَ.

«تَقِيَانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب.«تَقِينَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب دروست ئەکرێن وەکو تثنیە و جمعی مؤنثی غائب، وە یا خود ئەڵێین: - ئەصڵەکەی کرد بە مبنی، وە بو بە باعثی حەذفی نونی مفردی مؤنثی مخاطب، چونکی ئیعراب بوو، وە حەذفی یێ ضمیری فاعلی مفردی مؤنثی مخاطب مان کرد لە بەر ئەوە ئەم ضمیری جمع بوو.. وە ئەو ضمیری مفردی بوو، وە ئعادەی لام‌الفعلە محذوفەکەمان کردە وە گەڕا بە تَقین، لە سەر وەزی تَعِلْنَ لەبەر حەذفی فاءالفعلەکەی وە مانە وەی عین‌الفعلەکە و لام‌الفعلەکەی.«أَقِيْ» بۆ متکلمی وحدە.«نَقِي» بۆ متکلمی مع‌الغیر وە ئیعلال ئەکرێن وەکو: مفردی مذکر

**وَ تَقُولُ قِ فَيَصِير عَلٰى حَرْفٍ واحِدٍ، وَ يَلْزَمُهُ الْهٰاءُ فِي الْوَقْفِ.نَحْو: قِهْ قِيٰا قُو قِي قِيٰا قِينَ**

«وَ تَقُولُ قِ» تۆ ئەڵێ لە بنای ئەمری بە صیغەی مفرەدی مخاطب لە لفیفی مفروقا.

«قِ» بە تاقە حەرفێ کە عبارەتە لە عین‌الفعلی صیغە کە، لەبەر حەذفی فاءالفعلەکەی لە یاسای مثال دا، وە لام‌الفعلە کەی لە یاسای ئەمری معتل‌اللّام دا.«فَيَصِير عَلٰى حَرْفٍ واحِدٍ، وَ يَلْزَمُهُ الْهٰاءُ فِي الْوَقْفِ.نَحْو: قِهْ» جا ئەو فعلە ئەمرە دێتە سەر یەک حەرف وەلە حالەتی ڕاوەستان لەسەر یا پێویستی ئیلحاقی هێ یە بۆڕاوەستانی هەناسەی انسان ـ لە صیغەی ئە مرەکەدا تەنیا قافە مکسورە کە مایەوە، جا هێ سکتەمان پێوەنا بوبە (قِهْ)

«قِيٰا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب مشتقە لە تقیان بە حەذفی حەرفی مضارع وە حەذفی نونی ئیعراب.

«قُو» بۆ جمعی مذکری مخاطب مشتقە لە تقون بە حەذفی تێ لە ئەوەڵیەوە، وە نون لە ئاخریە وە.

«قِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب مشتقە لە تقین، بە حەذفی تێ لە ئەوەڵیەوە، وە نون لە ئاخریە وە، گەڕا بە قی.

«قِيٰا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب مشتقە لە تقیان، بە حەذفی تێ لە ئەوەڵیەوە، وە نون لە ئاخریە وە، گەڕا بە قیا.

«قِينَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب مشتقە لە تقین، بە حەذفی تێی مضارع و بەس، چونکە نونەکەی ضمیری فاعلە و بێ دلیل حەذف ناکرێ.

**وَ تَقُولُ فِي التَّأْكِيدِ: قِيَنَّ، قِيَانِّ، قُنَّ، قِنَّ، قِيَانِّ، قينانِّ، وَبالْخَفِيفَةِ: قِيَنْ ـ قُنْ ـ قِنْ.**

---

«**وَ تَقُولُ فِي التَّأْكِيدِ: قِيَنَّ، قِيَانِّ، قُنَّ، قِنَّ، قِيَانِّ، قينانِّ، وَبالْخَفِيفَةِ: قِيَنْ ـ قُنْ ـ قِنْ.**» تۆ ئەڵێیت لە کاتی تأکیدی ئەم صیغەی ئەمری مخاطبە بە نونی تأکیدی ثقیلە: ـ

«قِيَنَّ» بۆ مفردی مذکری مخاطب مشتقە لە (ق) نونی تأکیدی ثقیلەمان پێوە نا، وە لە بەر ئەوە موجب بوو بۆ فتحەی ماقبلی لامالفعلەکەمان ئیعادە کردە وە بە مفتوحی گەڕا بە قِيَنَّ.

«قِيَانِّ» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی قیا بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە، وە نونەکە مان مکسور کرد گەڕا بە قِيَانِّ.

«قُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی قوا بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە گەڕا بە قُوْنَّ، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی واو وە نونی تاکیدەکەدا، جا حەذفی واوەکەمان کرد لەبەر دەفعی التقاءالساکنین، وە ئیکتفامان کرد بە ضمەی ماقبلەکەی گەڕا بە قُنَّ.

«قِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی قِی بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە بۆ بە قِیْنَّ، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و نونەکەدا حەذفی یێ کەمان کرد لەبەر ئیکتفا بە کسرەی ماقبلەکەی گەڕا بە قِنَّ.

«قِينانِّ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب ئەصڵەکەی قِینَ بوو، مؤکدمان کرد بە نونی تأکیدی ثقیلە وە، وە هاتین بە ئەلفێ لە بەینی نونەکاندا وە نـونە تأکیدەکەمان مکسور کرد گەڕا بە قِينانِّ.

## وَتَقُولُ : وَجِيَ يَوْجِي، كَرَضِيَ يَرْضى وَالأَمْرُ: ايجَ كَأَرْضَ

«وَبِالْخَفِيفَةِ: قِيَنْ، قُنْ، قِنْ.» وە تۆ ئەڵێیت لە کاتی تاکیدی ئەمری بە صیغە بە نونی تأکیدی حفیفەوە:-

«قِيَنْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی (ق) بوو مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە، وە نون موجبی فتحەی ماقبلی بوو ماقبلەکەمان مفتوح کرد لام‌الفعلە محذوفەکەی گیرایە وە سەر حاڵی خۆی و گەڕا بە قِيَنْ.

«قُنْ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی قو بوو، مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە، التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی واو وە نونەکەدا، جا واوەکەمان حەذف کرد، وە ئیکتفامان کرد بە ضمەی ماقبلەکەی گەڕا بە قُنْ.

«قِنْ» بو مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی قی بوو، مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە، التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و نونەکەدا، جا حەذفی یێ کەمان کرد وە ئیکتفامان کرد بە کسرەی ماقبلەکەی گەڕا بە قِنْ.

ئێتر نونی خفیفە لاحق نابێ بە تثنیە و جمعی مؤنثەوە.

«وَتَقُولُ : وَجِيَ يَوْجِي، كَرَضِيَ يَرْضى» یانی تۆ ئەڵێیت: -وَجِيَ يَوْجِي کە لفیفی مفروقە لە بابی رابع دا وەکو تلفظ ئەکەی بە معتل‌اللامی ئەو بابە «وَالأَمْرُ: ايجَ كَأَرْضَ» بۆ ئەمری مخاطبی مفردی مذکری ئەم بابە ئەڵێیت ایج، وەکو ارض مشتقە لە تَوْجِي وەکو تعلم، تێ حەرفی مضارع بوو حەذفمان کرد، وە هاتین لە ئەوەڵیە وە بە همزەی وەصڵی مکسورە وە ئاخرەکەمان مجزوم کرد بە حەذفی لام‌الفعل گەڕا بە اِوْجَ، جا واو ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە ايجَ.

# اَلنَّوعُ السَّادِسُ: اَلْمُعْتَلُّ الْفَاءُوَالْعَيْنُ

اَلنَّوْعُ السَّادِسُ اَلْمُعْتَلُّ الْفَاءُ وَالْعَيْنُ كَيَيْنٍ فِى اِسْمِ مَكَانٍ، يَوْمٍ وَ وَيْلٍ وَ لَا يُبْنٰى مِنْهُ الْفِعْلُ

---

«اَلنَّوْعُ السَّادِسُ اَلْمُعْتَلُّ الْفَاءُ وَالْعَيْنُ» نەوعی شەشەم لە ئە نواعی معتل لفظێکە کە فاءالفعل وە عین‌الفعلە کەی حەرفی علّە بن.

«كَيَيْنٍ فِى اِسْمِ مَكَانٍ، يَوْمٍ وَ وَيْلٍ» وەکو لفظی: يَيْن کە فاءالفعل وە عین‌الفعل هەر دوکیان یێ یە ولە حروفی عللەن، وە يَوْم اسمی زەمانە، کە فاءالفعل و عین‌الفعلە کەی عللەن.وە ویل کلمەی تورِە بونە.

«وَ لَا يُبْنٰى مِنْهُ الْفِعْلُ» بە استقراء دەر کەو تـووە کـە فـعل دروست ناکرێ لەم نەوعە معتلە.

## النوعُ السّابعُ: المُعتَلُّ الفاءُ وَالعَينُ واللّامُ

النَّوعُ السّابعُ: المعتَلُّ الْفاءُ وَالْعَيْنُ وَاللاّمُ وَ ذٰلِکَ: واوٌ وَ ياءٌ، لِإِسْمَي الْحَرْفَيْنِ

---

«النَّوعُ السّابعُ: المعتّلُ الْـفاءُ وَالْـعَيْنُ وَاللاّمُ»نـەوعی حـەوتەم لە حەوت نەوعەکەی معتل ئەوە یەکە: فاءالفعل وە عینالفعل وە لامالفعلی بە سەر یەکە وە حەرفی علله بن.

«وَ ذٰلِکَ: واوٌ وَ ياءٌ، لِإِسْمَي الْحَرْفَيْنِ» وە مثالی ئەم جۆرە معتلەیش هەر لفظی واو وە لفظی یاء کە ناون بو ئەو دو حەرفە لە حروفی ئەلفـو بێ.

وە ئەصلی واو (وَوَوَ) بوو بەسێ واو جا قەلبی عینالفعلە کەمان کرد بە ئەلف بە یاسای ئیعلال گەڕا بە واوٌ ئەصلی یاء (يَيَيٌ) بوو بە سێ یێ.جا قەلبی عینالفعلە کەمان کرد بە ئەلف بە یاسای ئیعلال گەڕا بـە یـای، جـا قەلبی یێ ئاخرە کەمان کرد بە همزە گەڕا بە یاءٌ.

# فَضْـــلٌ

فَصْلٌ فِی الْمَهْمُوزِ حُكْمُ الْمَهْمُوزِ فِی تَصٰارِیفِ فِعْلِهِ كَحُكْمِ الْـصَّحِیحِ لِأَنَّ الْمَهْزَةَ حَرْفٌ صَحِیحٌ لٰكِنَّهٰا قَدْ تُخَفَّفُ إِذٰا وَقَعَتْ غَیْرَ أَوَّلٍ فَتَقُولُ: أَمَلَ یَأْمُلُ كَنَصَرَ یَنْصُرُ وَالأَمرُ: أُومُلْ بِقَلْبِ الْهَمْزَةِ واوً. لِأَنَّ الْهَمْزَتَیْنِ إِذَاالْتَقَتٰافِی كَلِمَةٍ وٰاحِدَةٍ وَ ثٰانِیهِمٰا سٰاكِنَةٌ وَجَبَ قَلْبُهٰا بِحَرَكَةِ مٰاقَلْبَهٰا

---

«فَصْلٌ فِی الْمَهْمُوزِ» ئەمە فصلێكە باسی ئەحكامی ئەو لفظانە ئەكات كە همزەیان تێدایە فعل بن یا اسم بن.

«حُكْمُ الْمَهْمُوزِ فِی تَصٰارِیفِ فِعْلِهِ كَحُكْمِ الصَّحِیحِ» حوكمی مهموز له تحویلی مصدەرە كە یا بولای مشتقات وەكو: ـ فعلی ماضی و مضارع و ئەمر و نەهی و اسمی فاعل و اسمی مفعول و غیری ئەمانیشن وەكو سالم وایە.

«لِأَنَّ الْمَهْزَةَ حَرْفٌ صَحِیحٌ لٰكِنَّهٰا قَدْ تُخَفَّفُ إِذٰا وَقَعَتْ غَـیْرَ أَوَّلٍ» بەلام هەندێ جار تخفیف بە سەر هەمزەكەیدادێت بە قلب یا حەذف یا بە تسهیل ئەگەر ئەو همزە یە لە ئەوەلی كلمە كە وەبێ. «لِأَنَّهٰا حَرْفٌ شَدِیدٌ مِنْ أَقْصَی الْحَلْقِ» لەبەر ئەوە كە همزە حەرفێكی گران و ناباره له تلفظ دا چونكی له لای ژووری گە رو دایە، كە وابێ زۆر مناسبە لەگەڵ سوک كردنا.

«فَتَقُولُ: أَمَلَ یَأْمُلُ كَنَصَرَ یَنْصُرُ» تۆ ئەڵێی أمل یأمل وەكو نصر ینصر. «وَالأَمرُ: أُومُلْ بِقَلْبِ الْهَمْزَةِ واوً. لِأَنَّ الْهَمْزَتَیْنِ إِذَاالْتَقَتٰا فِی كَلِمَةٍ وٰاحِدَةٍ وَ ثٰانِیهِمٰا سٰاكِنَةٌ وَجَبَ قَلْبُهٰا بِحَرَكَةِ مٰاقَلْبَهٰا» چونكی كاتێ

كَأَمَنَ و ئُومِنَ و اِيمَاناً فَإِنْ كَانَتْ الأُولَى مِنَ الْهَمْزَتَيْنِ هَمْزَةَ وَصْلٍ تَعُودُ الثَّانِيَةُ هَمْزَةً عِنْدَالْوَصْلِ اِذَاانْفَتَحَ مَاقَبْلَهَا.

---

دوهه مزه گرد بوو یەوە پێکه وه لەیەک کلمه دا وه همزەی دوهەمیان ساكن بوو، ئەوه قلبی همزەی ثانی ئەكرێ بە حەرفێ كە موناسبی حرەكەی همزەی پێشوی بێ.یانی ئەگەر همزەی پێشو مفتوح بێ ئەوه همزەی دوهەم ئە كرێ بە ئەلف، وه ئەگەر مضموم بوو ئە كرێ بە واو، وه ئەگەر مكسور بوو ئەكرێ بە یێ.

«كَأَمَنَ و ئُومِنَ و اِيمَاناً» ئەوەڵ بنافاعلی ماضی بابی افعاله، ئەصڵە كەی أَأْمَنَ بوو، وەكو أكرم قەلبی همزەی ثانیمان كرد بە حەرفی موناسبی حەرەكەی ئەوەڵ بە ئەلف.دووهەم بنامفعولی ماضی بابی افعاله قەلبی هەمزەی ثانیمان كرد بە واو (بە پێی یاسا).وە سێهەم مصدەری بابی افعاله، وەكو اكرام قەلبی همزەی ثانیمان كرد بە یێ.

ئەم قاعده یه عامه بۆ هەموو شوێنێ چه همزەی ئەوەڵ همزەی قطع بێ وەكو ئەم مثالانه یا خود همزەی وەصڵ بێ.

ئەوەنده هەیە، ئەگەر همزەی وەصڵی بێ حوكمێكی جیاواز بۆ همزەی ثانی هەیە وەكو مصنف ئە فەرمویت: «فَإِنْ كَانَتْ الأُولَى مِنَ الْهَمْزَتَيْنِ هَمْزَةَ وَصْلٍ تَعُودُ الثَّانِيَةُ هَمْزَةً عِنْدَالْوَصْلِ اِذَاانْفَتَحَ مَاقَبْلَهَا.»

واته ئەگەر همزەی ثانی لە دوو همزه كە، همزەی وەصڵ بوو، ئەوه ئەو همزه ثانیه قەلب كراوه ئەگەرێتەوه بۆ سەر ئەصڵی خۆی كه همزه بووه، كاتی كه ماقبلی همزه ثانیه كه مفتوح بێ «نَحْو: قَوْلِهِ تَعَالَى: اِلَى الْهُدَى اءْتِنَا»

........................................................................

بۆ ئەمری مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵە کەی إِئْتِ بوو، بە دو هەمزە، ئەوەڵ همزەی وەصڵی مکسورە، دوهەم هەمزەی فاءالفعل، جا ئەم هەمزەی ثانیمانە کرد بە یێ، چونکی خۆی ساکن وە ماقبلە کە مکسور بوو.وە پاش ئەوە کە بە سرا بە ماقبلەکە یە وە یعنی الی‌الهدی همزە وەصڵەکە لە ناوا ڕۆیشت، وە التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی ئەلفی ئاخری هُدیٰ وە یێ ساکنە کە،کە بەدەڵی همزەی ثانی‌یە، جا حەذفی ئەلفی هدی کراو، وە ئەم یێ ساکنە گەڕا یە وە بوسەر ئەصڵە کەی کە همزە بوو، وە خوێند مانە وە الی الهدَی ائتنا بە فتحەی دالی هُدَی، و ئیعادەی همزەی فاُالفعلە کە لەبەر ئەوە سەبەبی قەلبی بە یێ کە همزە وەصڵە کە بولە بە ینارۆ یشتوە ولە ئارا دانە ماوە.

«بیداربن»: هەر چەند مصنف ئەم حوکمەی بەست بە همزەیە کەوە ماقبلەکەی مفتوح بێ، بەلاّم حوکمی همزەی ماقبلە کەی مضموم بێ یا مکسور بێ ئەویش وەکو ماقبل مفتوح وەهایە، یانی ئەوانیش پاش قەلب مادام همزەی پێشیان همزەی وەصڵ بێ وە لە ناوابڕوا ئەوە ئەگەڕێتە وە بە همزە...

نمونەی یەکەم: وەکو (اِئْذَنْ لِی) لە ئایەتی پیرۆزی: ـ وَمِنْهُمْ مَنْ یَقُولُ ائذَنْ لِی.وەختی خۆی همزەی ثانیمان کرد بە یێ چونکی همزەی پێشو مکسور بوو، پاش ئەوە کەو تە دوای یقول، وە همزە وەصڵە کە لەناوانەما، وە ماقبلە کەی مضموم بوو وەکو لامی یقول همزە ثانیە کەمان گیڕایە وە بە همزە.

## حُذِفَتِ الْهَمْزَةُ فِي: خُذْ وَ كُلْ وَمُرْ عَلَى غَيْرِالْقِيَاسِ وَ قَدْ يَجِئُ أُأْمُـرْ عَلَى الأَصْلِ عِنْدَالْوَصْلِ

نمونەی دوهەمی وەکو (أُؤْتُمِنَ) کە بنامفعولی ماضی بـابی افتعاله له ئایەتی: (فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ) هـمزەی ثـانیمان کـرد بـه واو چـونکه همزەی ئەوەڵ مضموم بو بەڵام لەپاش ئـەوە کـە وتـەپاڵ الّـذی وە هـمزە وەصڵە کە لە ناوانەما وە یێ ی الذی لەبەر التقاءالساکنین لاچو، وە ماقبله کەی بوبە ذالی الذی کە مکسورە واوە کە لابـراوە هـمزە کـە مـان هـێنایه وە.جاله بەر ئەوە یەکێ ئەپرسێ ئەڵی مادام دەستوری تخفیف بـاعثە بـۆ ئەوە کە همزەی دوهەم بکرێ بە ئەلف یا بە یێ یا بە واو.

بۆچی لە ئەمری مخاطبی مادەی أخذ، أکل، أمر ناڵێین: أوخذوە أوکل وە أومُرْ بە قەلبی همزەی ثانی بە واو وە ئەڵێین: خُذْ، کُلْ، مُرْ مصنف رحمه الله جوابی دایەوە وە فەرموی: «حُذِفَتِ الْهَمْزَةُ فِي: خُذْ وَ كُلْ وَمُرْ عَلَى غَيْرِالْقِيَاسِ» واتە حەذفی همزە لەم ئەمرانـە دا بـە خـلافی قـیاس کـراوە چونکە ئەم لفظانە زۆر گرانن لە سەر زمان وە پێویسیان هەیە بە تخفیف وە ئەصڵەکەیان أأخذ أأکل أأمر بو بە دو همزە لە سەر وەزنی أنصر همزەی دوهە میان حەذف کرد لەبەر تخفیف ئـینجابێ ئـیحتیاج بـووین لە هـمزە وەصڵە کە وە حەذفمان کرد گەران بە خُذْ، کُلْ، مُرْ لە سەر وەزنی عُلْ بـه حەذفی فاءالفعل «وَ قَدْ يَجِئُ أُأْمُرْ عَلَى الأَصْلِ عِنْدَالْوَصْلِ» وە جار بە جار أأمر ئەخوێنرێتە وە لەسەر رەوشتی قاعدەی پێشو کە عبارەت بوو لە قەلبی همزەی دوهەم بە حەرفێ کە مناسبی حەرەکەی ماقبلە کەی بێ، وە

كَقَوْلِهِ تَعَالٰى: ـ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ وَأَزَرَ يَأْزِرُ، وَ هَنَأَ يَهْنِأُ، كَضَرَبَ يَضْرِبُ و الأمر ايزر وَأَدُبَ يَأْدُبُ كَكَرُمَ يَكْرُمُ وَالْأَمْرُ أُودُبْ وَ سَأَلَ يَسْأَلُ، كَمَنَعَ يَمْنَعُ وَالْأَمْرُ إِسْأَلْ وَيَجوُزُ: سَالَ يَسَالُ سَلْ

---

ئیعادەی ئەو همزەیە لەکاتێکا همزەی وەصڵ بو بێتو لە ناوانە مابێ «كَقَوْلِهِ تَعَالٰى: ـ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلاةِ» وەکو لفظی أأمر لەم ئایەتەدا، وە ختی خۆی همزەی ثانیمان کرد بە واو چونکی خۆی ساکن بوو، وە ماقبلە کەیشی مضموم بوو، بەڵام لە کاتێکا واو کەوتە سەر همزە پێشوە کە لەناو رۆیشت، وە همزەی دوهەم زیندو کرایەوە.

«وَأَزَرَ يَأْزِرُ، وَ هَنَأَ يَهْنِأُ، كَضَرَبَ يَضْرِبُ» یانی مهموزالفاء و مهموزاللّامی بابی ثانی، وەکو فعلی سالم بابی ثانی وایە «و الأمر ایزر» لە سەر وەزنی اضرب ئەصڵەکەی أَأْزِرْ بوو وەکو اضرب بە دو همزە، جا همزەی ثانیمان کرد بە یێ بە قاعدەی پێشو گەڕا بە ایـزِرْ.«وَأَدُبَ يَأْدُبُ كَكَرُمَ يَكْرُمُ» یانی مهموزی بابی سادس وەکو سالمی ئەو بابە وایە «وَالْأَمْرُ أُودُبْ» ئەصڵەکەی أأدب بوو وەکو أحسن قەلبی همزەی ثانیمان کرد بە واو بە یاسای پێشو گەڕا بە أُودُبْ.

«وَ سَأَلَ يَسْأَلُ، كَمَنَعَ يَمْنَعُ» یانی ماضی مهموزی بابی بە شەرت ـ بابی ثالث ـ وەکو ماضی سالمی ئەو بابە وایە.

«وَالْأَمْرُ إِسْأَلْ» وە ئەمرەکەی عبارەتە لە إِسْأَلْ بەبی دەست لێدان و گۆڕینی وەکو إِمْنَعْ.«وَيَجوُزُ: سَالَ يَسَالُ سَلْ» وە دروستە قەلبی هەمزەی ئەم بابە بکەی بە ئەلف، وە لە ماضی و مضارعەکە یا بڵێیت سال یسال، وە بو ئەمرەکەی بڵێیت: سَلْ کە مشتقە لە تَسَالُ بە حەذفی حەرفی مضارعە

**و آبَ یَؤُوبُ، وَسٰاء یَسُوءُ، کَصٰانَ یَصُونُ وَجٰاءَ یَجِیءُ، کَکٰالَ یَکِیلُ فَهُوَ: سٰاءٍ و جٰاءٍ وَأَسٰایَأْسُو، کَدَعٰا یَدْعُو وَأَتٰی یَأْتِی کَرَمٰی یَرْمِی**

کـەی و اسکـانی ئاخرە کـەی، وە حـەذفی ئـەلفە کـەی لە بـەر دەفـعی التقاءالساکنین.

«و آبَ یَؤُوبُ، وَسٰاء یَسُوءُ، کَصٰانَ یَصُونُ» واتـە حـوکمی بـابی ئەوەڵ لە مهموزالفاء وە مهموزاللّامی ئەجوەف وەکو حوکمی بابی ئەوەڵە لە ئەجوەفی غیرە مهموز.«وَجٰاءَ یَجِیءُ، کَکٰالَ یَکِیلُ» یانی حوکمی بابی ثانی لە مهموزاللامی ئەجوەف، وەکـو بـابی ثـانی یـە لە ئـەجوەفی غـیرە مهموز.«فَهُوَ: سٰاءٍ و جٰاءٍ» بۆ اسمی فاعلی سٰاءَ جٰاءَ ئەصڵە کەیان ساوءٌ وە جایءٌ بوو عینالفعلە کەمان قلب کردن بە همزە بـە یـاسای ئـەجوەف گەڕان بە ساءُ وە جاءء بە دو همزە عینالفعل وە لامالفعل جا همزە ثـانیە کەمان قەلب کرد بە یێ لە بەر ئەوە کە لە طـرفە وە بـوو، وە مـاقبلە کـەی مکسور بوو گەڕان بە سٰائِیٌ وە جٰائِیٌ وەکو قاضی، جا ضمە لەسەر یێ ثقیل بـوو، حـەذفمان کـرد وە حـەذفی یـێ کـەیشمان کـرد لە بـەر دەفـعی التقاءالساکنین لە بەینی یێ و تنوینە کەیداگەڕا بە سٰاءٍ وە جٰاءٍ لە سەر وەزنی فٰاعٍ. «وَأَسٰایَأْسُو، کَدَعٰا یَدْعُو» یانی حوکمی مهموزالفای نـاقصی بـابی ئەوەڵ، وەکو حوکمی بابی ئەوەڵە لە ناقصی غیرە مهموزا.

«وَأَتٰی یَأْتِی کَرَمٰی یَرْمِی» یانی حوکمی بابی ثانی لە مهموزالفـای ناقصدا وەکو حوکمی بابی ثانی یە لە ناقصی غیرە مهموزا.

**وَالأَمْرُ إِيتِ وَمِنهُمْ مَنْ يَقُولُ: تِ تَشْبِيهاً لَهُ بِخُذْ وَ وَأَىٰ يَأْى، كَوَقْى يَقِى وَالأَمْرُإِ وَوَأَىٰ يَأْوِي أَيَّاً، كشَوْى يَشْوِى شَيّاً وَالأَمْرُ إِيوِ كَأَشْوِ**

«وَالأَمْرُ إِيتِ» بۆ ئەمری مخاطب ئەڵێت ایتِ، ئەصڵەکەی اِئْتِ بوو، بە دو همزە یەکێ ئەصڵ وە یەکی وەصڵ، جا همزەی ثانیمان قەلب کرد بە یێ بە قاعدەی سابق گەڕا بە ایت.«وَمِنهُمْ مَنْ يَقُولُ: تِ تَشْبِيهاً لَهُ بِخُذْ» یانی لە عەرەبەکانە کە سێ کە حەذفی همزەی فاءالفعل ئەکات لە بەر تخفیف حەرفی، وەکو ئەمری تأخذ حەذفی فاءالفعلەکەی وە همزە وەصڵەکەی ئەکرد و ئەیوت خُذْ.

«وَ وَأَىٰ يَأْى، كَوَقْى يَقِى» یانی حوکمی بابی ثانی لە مهموزالعینی لفیفی مفروقدا، وەکو حوکمی بابی ثانییە لە غیرە مهموزی لفیفی مفروقدا.ئەصلی یئی یَوْئِيُ بوو، وەکو یَوْعِدُ حەذفی واوەکەمان کرد بە قاعدەی مثال، وە حەذف ضمەی یێ کەمان کرد لە بەر ثقیلی گەڕا بە يَئِى.«وَالأَمْرُإِ» واتە ئەمری مخاطبی ئەم بابە ئەبی بە (إِ) بە یەک حەرف ئەصڵەکەی تئی بوو، تێ حەرفی مضارع بو حەذفمان کرد، وە ئاخرەکەمان محذوف کرد بە حەذفی لامالفعلە گەڕا بە إِ.

«وَوَأَىٰ يَأْوِي أَيَّاً، كشَوْى يَشْوِى شَيّاً» واتە حوکمی بابی ثانی لە مهموزی لفیفی مقروندا، وەکو حوکمی بابی ثانی یە لە لەفیفی مقرونی غیرە مهموز، وە ئەصڵی أَيّا بە تشدیدی یا أَوْياً بوو، قەلبی واوەکەمان کرد بە یێ گەڕا بە أَيّاً.«وَالأَمْرُ إِيوِ كَأَشْوِ» بۆ ئەمری مخاطبی مفردی مذکر ئەصڵەکەی اِئْوِ بوو بە همزەی وەصڵی مکسورە وە همزە ئەصڵی ساکنە جا قەلبی همزەی ثانیمان کرد بە یێ گەڕا بە ایو.

وَنَأَىٰ يَنْأَىٰ، كَرَعٰى يَرْعٰى وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ رَأَىٰ يَـرْأَىٰ لٰكِـنَّ الْـعَرَبَ قَدِاجْتَمَعَتْ عَلٰى حَذْفِ الْهَمْزَةِ مِنْ مُضٰارِعِهِ فَـقٰالُوا: يَـرٰى، يَـرَيٰانِ، يَرَوْنَ*تَرٰى، تَرَيٰانِ، يَرَيْنَ ـ تَرٰى، تَرَيٰانِ، تَرَوْنَ * تَرَيْنَ، تَرَيٰانِ، تَرَيْنَ ـ أَرٰى، نَرٰى

---

«وَنَأَىٰ يَنْأَىٰ، كَرَعٰى يَرْعٰى» یانی حوكمی بابی بە شرط ـ بابی ثالث ـ لە مهموزالعینی ناقص‌دا، وەكو حوكمی بـابی بـە شـرط لە نـاقصی غـیرە مهموز وایە.

«وَ هٰكَذٰا قِيٰاسُ رَأَىٰ يَرْأَىٰ» هەر وەكو نأى ینأى وایە، دەستوری رأى یرأى وەحەق وایە همزەی عین‌الفعلە كەی بمێنێتە وە.

«لٰكِنَّ الْعَرَبَ قَدِاجْتَمَعَتْ عَلٰى حَذْفِ الْهَمْزَةِ مِنْ مُضٰارِعِهِ» بە لّام عەرەب یەكیان گرتوە لە سەر ئەوە كە حەذفی عین‌الفعلی مضارعە كـەی بكەن لە بەر تخفیف «فَقٰالُوا: يَرٰى، يَرَيٰانِ، يَرَوْنَ*تَرٰى، تَرَيٰانِ، يَرَيْنَ ـ تَرٰى، تَرَيٰانِ، تَرَوْنَ * تَرَيْنَ، تَرَيٰانِ، تَرَيْنَ ـ أَرٰى، نَرٰى»

ئەصڵی يَرٰى، يَرْأَى بو وەكو یعلم نقلی حەرەكەی همزە كـەمان كـرد بولای ماقبلە كەی جا حەذفمان كرد گەڕا بە یری وە ئەصڵی يَرَيٰانِ، یـری بوو، ئەلف ضمیری فاعلی تثنیە بۆلاحقمان كرد بە ئاخریە وە لەگەڵ نونی ئیعرابدا، وە ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو ماقبلە كەمان مفتوح كرد گەڕا بە یریان.

وە ئەصڵی يَرَوْنَ، يَرٰى بـوو، واو ضـمیری فـاعلی جـمعی مـذكر بـوو ئیلحاقمان كرد بە ئاخریەوە لە گـەڵ نـونی ئیعرابـدا، واو بـاعثی ضـمەی بووماقبلی بوو ماقبلە كەمان ئیعادە كردە وە بە مضمومی جا ضمە لە سەر

.........................................................................

یێ ثقیل حەذفمان کرد.

جا التقاءالساکنین روی داله بەینی یێ و واوەکەدا، وە یێ کەمان حەذف کرد، وە واوەکەمان هێشتە وە لەبەر ئە وە دەلیلی نە بوو لە سەری گەڕا بە یَرَوْنَ.

وە تَرٰی بۆ مفردی مؤنثی غائب وەکو یری.وە تَرَیٰانِ بو تثنیەی مؤنثی غائب وەکو یریان.

وە یَرَیْنَ بو جمعی مؤنثی غائب، ئەصڵە کەی یری بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنث بوو، ئیلحاقمان کرد بە ئاخریەوە نون موجبی سکونی ماقبلی بوو ماقبلە کەمان ساکن کرد گەڕا بە یَرَیْنَ.

وە تَرٰی بۆ مفردی مذکری مخاطب.وە تَرَیٰانِ بو تثنیەی مذکری مخاطب.وە تَرَوْنَ بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەمانە وەک یَرٰی، یَرَیٰانِ، یَرَوْنَ دروست ئەکرین.

تَرَیْنَ بۆ مفردی مؤنثی مخاطب ئەصڵە قەریبە کەی تری بوو یێ ضمیری فاعلی مؤنثی مخاطب بوو ئیلحاقمان کرد بە ئاخرەوە لەگەڵ نونی ئیعرابدا، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی لام‌الفعل وە یێ ضمیرەکەدا، وە حەذفی لام‌الفعلە کەمان کرد، حەذفی یێ ضمیرە کەمان نەکرد چونکە ماقبلە کەی مکسور نەبوو هەتا دەلالەت بکات لەسەری گەڕا بە تَرَیْنَ.

تَرَیٰانِ وەکو وینەی سابق.تَرَیْنَ: بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە کەی تری بوو، نون ضمیری فاعلی جمعی مؤنثی مخاطب بو ئیلحاقمان کرد بە

وَ قَدْ اتَّفَقَ فِی‌الْخِطاٰبِ الْمُؤَنَّثِ لَفْظ الْوٰاحِدَةِ وَالْجَمْعِ، لٰکِنَّ وَزْنُ الْوٰاحِدَةِ تَفِینَ، وَالْجَمْعِ تَفِلْنَ. فَإِذٰا أَمَرْتَ مِنْهُ قُلْتَ عَلَی‌الأَصْلِ: اِرْءَ کَأَرْعَ

---

ئاخریه وە، وە نون مقتضی سکونی ماقبلی بو ماقبلە کەمان ساکن گەڕا بە ترین.

وە ئەگەر ئیعتباری ترین بکەین بە ئەصڵ بوی، ئەلیێن نونی جمعی مؤنث لە بەر ئەوە فعلە کە ئەکات بە مبنی بوبە باعثی حەذفی نونی ئیعرابی مفردی مخاطب، وە یێ فاعلی مفردی مؤنث بوو مایەوە تَرَیْنَ لە سەر حاڵی خۆی.

أَرَیٰ بۆ متکلمی وحده، و نَرٰی بۆ متکلمی مع‌الغیر دروست ئە کرێن وەکو یَری.

«وَ قَدْ اتَّفَقَ فِی‌الْخِطاٰبِ الْمُؤَنَّثِ لَفْظ الْوٰاحِدَةِ وَالْجَمْعِ، لٰکِنَّ وَزْنُ الْوٰاحِدَةِ تَفِینَ، وَالْجَمْعِ تَفِلْنَ.» واتە وا هەڵکەوتووە لەم بابا صیغەی مفردی مؤنثی مخاطب لە گەڵ جمعی مؤنثی مخاطب وەکو یەک بن لە صورەتا بەڵام لە تقدیرا لە یەک جیان لە بەر ئەوە لە مفرەدەکە دا لام‌الفعل و عین‌الفعل محذوفە وە وەزنە کەی ئەبێ بە تَفِیْن ـ وە لە جمعە کەدا هەر عین عین‌الفعلە کە محذوفە وە لام‌الفعلە کەی باقیە، وە وەزنە کەی تَفَلْنَ ئە بێ.

«فَإِذٰا أَمَرْتَ مِنْهُ قُلْتَ عَلَی‌الأَصْلِ: اِرْءَ کَأَرْعَ» کاتێ صیغەی ئەمری مخاطبت دروست کرد لەم بابە لەسەر یاسای مانە وەی همزە کەی ئەڵێێ ارأ وەکو ارع مشتقە لە ترەی بە حەذفی حەرفی مضارع وە زیاد کردنی

وَ قُلْتَ عَلَى تَقْدِيرِ الْحَذْفِ رَ وَيَلْزَمُهُ الْهَاءُ فِي الْوَقْفِ رَيَا رَوْ رَيَا رَيْنَ

همزەی وەصڵی مكسورە وە حەذفی لامالفعل جا ئەبێ بە اِرْءَ وەكو اِرْعَ مشتقە لە ترعی بە یاسای پێشو.

«وَ قُلْتَ عَلَى تَقْدِيرِ الْحَذْفِ رَ» وە ئەڵێیت لە سەر ئەمری مخاطبی مادەی رأی دا لەسەر ئەساسی حەذفی همزەی وەصڵەكەی (ر) بە یەك حەرف مشتقە لە تَرىٰ بە حەذفی حەرفی مضارعەكەی و لامالفعلەكەی.

«وَيَلْزَمُهُ الْهَاءُ فِي الْوَقْفِ» جالە بەر ئەوە ئەم صیغەی ئەمرە یەك حەرفە واجبە ئیلحاقی هێی سكتە لە كاتی وەقفە لە سەری.

«رَيَا» بۆ تثنیەی مذكری مخاطب، مشتقە لە تَرَيَانِ بە حەذفی حەرفی مضارع وە نونی ئیعراب.

«رَوْ» بۆ جمعی مذكری مخاطب، مشتقە لە تَرَوْنَ بە حەذفی حەرفی مضارع وە نونی ئیعراب.

«رَيْ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، مشتقە لە تَرَيْنَ بە حەذفی حەرفی مضارع وە نونی ئیعراب.

«رَيَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، مشتقە لە تَرَيَانِ بە حەذفی حەرفی مضارع وە نونی ئیعراب، وەكو تثنیەی مذكری مخاطب.

«رَيْنَ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، بە حەذفی حەرفی مضارع وە هێشتنە وەی نونەكەی لەبەر ئەوە ضمیری فاعلە.

## وَ بِالتَّأْكِيدِ: رَيَنَّ، رَيَانِّ، رَوُنَّ، رَيِنَّ، رَيَانِّ، رَيْنَانِّ

«وَ بِالتَّأْكِيدِ: رَيَنَّ، رَيَانِّ، رَوُنَّ، رَيِنَّ، رَيَانِّ، رَيْنَانِّ» تۆ ئەڵێی لە کاتی تأکیدی ئەمری ئەم مادە بە نون.

«رَيَنَّ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی (رَ) بوو بە یەک حەرف مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە، وە لامالفعلەکەمان هێنایە وە بە مفتوحی لەبەر نونەکە گەڕا بە رَيَنَّ.

«رَيَانِّ» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی ریا بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە، وە نونەکەمان مکسور کرد گەڕا
بە رَيَانِّ.

«رَوُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی رَوْ بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە، جا التقاءالساکنین ڕوی‌دا لە بەینی واو وە نونەکەدا، دروست نەبوو حەذفی نونەکەی بکەین لە بەر ئەوە هاتبو بۆ تأکید، وە دروستیش نەبوو حەذفی واوەکە بکەین چونکی ماقبلەکەی مفتوح بوو، وە دەلیل نەبوو لەسەری ناچار متحرکمان کرد بە حەرەکەی مناسبی خۆی بێ وەکو ضمە گەڕا بە رَوُنَّ.

«رَيِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی رَیْ بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یی و نونەکەدا، دروست نە بوو حەذفی نونەکە بکەین لە بەر رعایەتی تأکیدەکە، وە دروستیش نە بوو حەذفی یێ کە بکەین چونکە ماقبلەکەی مفتوح بو، وە هیچ شتێ نەبوو دەلالەت بکات لە سەری، ناچار مکسورمان کرد لەبەر

## وَبِالْخَفِيفَةِ: رَيَنْ، رَوُنْ، رَيِنْ

مناسبەی کسرە لە گەڵ یێ گەڕا بە رَيِنَّ.

«رَيَانِّ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، دروست ئەکری وەکو تثنیەی مذکری مخاطب.

«رَيْنَانِّ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی رَيْنَ بوو مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە هاتین بە ئەڵفی لە بەینی هەر دو نونەکەدا، وە نونەکەمان مکسور کرد گەڕا ریناںِّ.

«وَبِالْخَفِيفَةِ: رَيَنْ، رَوُنْ، رَيِنْ» تۆ ئەڵیی لە کاتی تأکیدی فعلی ئەمری بە صیغەی ئەم مادە بە نونی خفیفە.

«رَيَنْ» بۆ مفردی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی (رَ) بوو بە یەک حەرف مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە ئیعادەی لام‌الفعلە کە مان کردە وە بە مفتوحی گەڕا بە رَيَنْ.

«رَوُنْ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی رَوْ بوو مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی واو نونەکەدا، دروست نەبوو حەذفی نونەکە بکەین لە بەر تأکیدەکە دروستیش نەبوو حەذفی واوە کە لەبەر ئەوە هیچ شتێ نەبوو دەلیل بێ لە سەری، ناچار واوەکەمان مضموم کرد لە بەر مناسبەی ضمە لە گەڵ واوەکەدا گەڕا بە رَوُنْ.

«رَيِنْ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب ئەصڵەکەی رَیْ بوو، مؤکدمان کرد بە نونی خفیفە وە، جا التقاءالساکنین ڕوی دالە بەینی یێ و نونەکەدا، دروست نەبوو حەذفی نونەکە بکەین لە بەر رعایەتی تأکید، وە حەذفی یێ

# فَهُوَ: رٰاءٍ، رٰائِيٰانِ، رٰاؤُنَ، كَرٰاعٍ، رٰاعِيٰانِ، رٰاعُونَ وَ ذٰاكَ مَرْئِيٌّ كَمَرْعِيٌّ

کە یش شتێ نەبوو دەلالەت بکات لە سەری، ناچار مکسورمان کرد لە بەر مناسبەی کسرە لە گەڵ یێ دا گەڕا بە رَیِنْ.ئیترنونی خفیفە لاحق نابی بە تثنیە و جمعی مؤنثەوە.

«فَهُوَ: رٰاءٍ، رٰائِيٰانِ، رٰاؤُنَ، كَرٰاعٍ، رٰاعِيٰانِ، رٰاعُونَ» یانی اسمی فاعلی ئەم مادە لەم بابەدا دروست ئەکرێ بە اثباتی همزە کەی.

ئەصڵی رٰاءٍ رائِی بوو وەکو عالم ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و تنوینە کەدا وە حەذفی یێ کەمان کرد گەڕا بە راءٍ لە سەر وەزنی فاعٍ.

وە ئەصڵی رائیان، رٰاءٍ بوو ئەلف و نونی تثنیە مان ئیلحاق کرد بە ئاخریە وە، وە ئیعادەی لام‌الفعلە کەمان کرد بە مفتوحی گەڕا بە رٰائِيٰانِ.

وە ئەصڵی راؤن، راءٍ بوو، واو وە نون عەلامەتی جمع بون لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە گەڕا بە رٰاءون وە ئەصڵە قەریبە کەی رائیون بوو، ضمە لە سەر یێ ثقیل بو، نقڵمان کرد بۆلای ماقبلە کەی، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و واوە کەدا حەذفی یێ کەمان کرد گەڕا بە رٰاؤُنَ.

«وَ ذٰاكَ مَرْئِيٌّ كَمَرْعِيٌّ» یانی اسمی مفعولی ئەم مادەلە ثلاثی مجرەدا بە اثباتی همزە ئەبێ، وە ئیعلالیشی ئەکرێ وەکوە ئیعلالی اسمی مفعولی ناقص لە غیری مهموزدا.

وە ئەصلی مَرْئِيٌّ مَرْئُويٌ بوو، وەکو ممنوع، واو وە یێ گرد بوونە وە

**وَبِنٰاءُ أَفْعَلَ مِنْهُ مُخٰالِفٌ لأَخَوٰاتِهِ أَيْضاً فَتَقُولُ: أَرٰى، يُرِى، إِرٰاءً، وَ إِرٰائَةً، وَ إِرٰايَةً**

قەلبی واوە کەمان کرد بە یێ، وەییێمان لە یێ‌دا دەغم کرد وە ماقبلە کەمان مکسور کرد گەڕا بە مَرْئِيٌّ وەکوە مَرْعِيٌّ.

**«وَبِنٰاءُ أَفْعَلَ مِنْهُ مُخٰالِفٌ لأَخَوٰاتِهِ أَيْضاً»** واتە بنای بابی افعال لەم مادەیە جیایە لە بنای ئەو مشتقاتە لە غیری ئەم مادە دا لەبەر ئەوە کە حەذفی همزە کەیان تیائە کرێ.بەڵام لە غیری ئەم مادە دا حەذفی عین‌الفعل ناکرێ.

**«فَتَقُولُ: أَرٰى، يُرِى، إِرٰاءً، وَ إِرٰائَةً، وَ إِرٰايَةً»**

ئەصڵی أَرٰی، أَرْأَیَ بوو، وەکو أکرم حەذفی همزە کە مان کرد لەبەر تخفیف، لە پاش نقڵی فتحە کەی بۆلای ماقبلە کەی وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەڕا بە أری، لەسەر وەزنی أَفَلَ بە حەذفی عین‌الفعل.

وە ئەصڵی یُرِی، یُرْئِیُ بوو وەکو یکرم حەذفی همزە کەمان کرد لەبەر تخفیف، پاش نقلی کسرە کەی بۆلای ماقبلە کەی، وە ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد گەڕا بە یُرِی.وە ئەصڵی إِرٰائَةً، إِرْآیاً بوو، وەکو إِکراماً حەذفی همزەکەمان کرد لەبەر تخفیف پاش نقڵی فتحەکەی بۆلای ماقبلە کەی، وەلەباتی ئەو همزە تیّ‌ی مصدرمان هێنالە ئاخریە وە لە گەڵ تنوین دا گەڕا بە ارايةً، جالە بەر ئەوە یێ‌ی لام‌الفعل لە پاش همزە وە بوو، قلبمان کرد بە همزە گەڕا بە اراءةً...

## فَهُوَ مُرٍ مُرِيٰانِ مُرُّونَ

إِرْاءً مصدەرە و ئیعلال ئەکرێ وەکو اراءً بە بێ تعویضی تـێ لە بـاتی عین‌الفعلەکەی.و ارایةً بە تعویضی تێ لە باتی عین‌الفعلەکەی، بەڵاّم قەلبی یێ کەی نەکراوە بە ئەلف لە بەر ئەوە بەڕاستی یێی لە طرەفە وەنیە.

«فَهُوَ مُرٍ» بۆ اسمی فاعلی مادەی رأی لە بابی افعال‌دا، وە ئەصڵەکەی مُرْئِيٌ بووە، وەکو مکرم، حەذفی همزەکەمان کرد لەبەر تخفیف پاش نقڵی کسرەکەی بۆلای ماقبلی، وە ضمە لەسەر یێ ثقیل بوو حەذفمان کرد، جا التقاءالساکنین ڕوی دا لە بەینی یێ و تنوینەکەدا، وە حەذفی تنوینەکەمان کرد گەڕا بە مُرٍ لە سەر وەزنی مُفٍ لەبەر حەذفی عین‌الفعل لام‌الفعلەکەی.

«مُرِيٰانِ» بۆ تثنیەی مذکر ئەصڵەکەی مُرٍ بوو، ئەلف و نونی تثنیەمان لاحق کرد پێوەی لە حاڵەتی رەفعە دا، ئەلف باعثی فتحەی مـاقبلی بـوو، یێی ماقبلەکەمان هێنایە وە بە مفتوحی گەڕا بە مُرِيٰانِ.

«مُرُّونَ» بۆ جمعی مذکر لە حاڵەتی رەفعەدا ئەصڵەکەی مُرٍ بوو، واو وە نون عەلامەتی جمعی مذکر بوون لە حاڵەتی رەفعە دا، ئیلحاقمان کرد پێیەوە، وە لام‌الفعلەکەمان هێناوە بە مضمومی لەبەر مناسبەی واوەکە گەڕا بە مُرِيُونَ.نقڵی ضمەی یێ کەمان کرد بۆ ماقبلەکەی دوای سلبی حرکەی ماقبلەکەی و حذفی یێ کەمان کرد لە بەر التقاءالساکنین گەڕا بە مُرُّونَ

«وَأَرَتْ» بۆ مفردی مؤنثی غائب لە فعلی ماضی بابی افعال دا، ئەصڵە کەی أرأيت بوو، وەکو أَكْرَمَتْ حەذفی همزە کـەمان کـرد لە پـاش نـقڵی فەتحەکەی بۆلای ماقبلەکەی، وە یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە

## فَهِيَ مُرِيَةٌ مُرِيَتٰانِ مُرِيٰاتٌ وَ ذٰاكَ مُرىً

ئەلف، جا التقاءالساكنين ڕوی دا له بەینی ئەلف وتیٚ کەدا ئەلفە کەمان حەذف کرد گەڕا بە أَرَتْ لەسەر وەزنی أَفَتْ، بە حەذفی عین‌الفعل و لام‌الفعله کەی.

«فَهِيَ مُرِيَةٌ» بۆ اسمی فاعلی مؤنثی بابی افعال لە مادەی رأی، ئەصڵە کەی مرئية بوو، وەکو مکرمة، حەذفی همزە کەمان کرد لە پاش نقڵی کسرە کەی بۆلای ماقبلە کەی، وە تیٚی تأنیث باعثی فتحەی ماقبلی بوو ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە مُرِيَةٌ.

«مُرِيَتٰانِ» بۆ تثنیەی مؤنثی ئەم بابە، ئەصڵە کەی مرية بوو، ئەلف و نون عەلامەتی تثنیە بوو لە حالەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، ئەلف باعثی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان مفتوح کرد گەڕا بە مريتان.

«مُرِيٰاتٌ» بۆ جمعی مؤنثی سالم، ئەصڵە کەی مرية بوو، ئەلف و تیٚی عەلامەتی جمعی مؤنثی سالم بون ئیلحاقمان کرد بە ئاخریە وە، جا حەذفی تیٚ تأنیثە مفرەدە کەمان کرد گەڕا بە مُرِيٰاتٌ.

«وَ ذٰاكَ مُرىً» بۆ اسمی مفعول مفردی مذکری بابی افعال لە مادەی رأی دا، ئەصڵە کەی، مُرْءَيٌ بوو وەکو مُكْرَمٌ، حەذفی همزە کەمان کرد لەبەر تخفیف لە پاش نقڵی فتحە کەی بۆلای ماقبلە کەی، جایێ متحرك ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، وە ئەلفە کە یشمان حەذف کرد لەبەر التقاءالساکنین لە بەینی ئەلف و تنوینە کەدا گەڕا بە مُرىً لەسەر وەزنی مُفىً، بە حەذفی عین‌الفعل و لام‌الفعله کەی.

## مُرَیٰانِ مُرَوْنَ مُرٰأَةٌ

«مُرَیٰانِ» بۆ تثنیەی مـذکر، ئـەصڵە کـەی مُـریً بـوو، ئـەلف و نـونی تثنیەمان لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاق کرد بە ئاخریە وە، وە لامالفعلە کەمان هێنایە وە بە مفتوحی گەڕا بە مُرَیٰانِ.

یا ئەڵێین: ـ ئەصڵە قە ریبە کەی مُرْأَیٰانِ بوو، وەکو مُکْـرَمٰانِ، حـەذفی همزە کەمان کرد لەبەر تخفیف، لە پاش نقڵی فتحەکەی بۆلای ماقبلە کەی گەڕا بە مُرَیٰانِ.

«مُرَوْنَ» بۆ جمعی مذکری اسمی مفعول لە حالی رەفعە دا، ئـەصڵە کەی مُریً بوو، واو وە نون عەلامەتی جمعی مذکر بون لە حاڵەتی رەفعەدا ئیلحاقمان کرد بە ئاخر یەوە، واو مقتضی ضمەی ماقبل بوو، ماقبلە کەمان ئیعادە کردە وە بە مضمومی گەڕا بە مُـرَیُونَ، یـێ مـتحرک مـاقبل مـفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف، جا ئەلفە کەمان حەذف کرد لەبەر التقاءالساکنین گەڕا بە مُرَوْنَ، لەسەر وەزنی مُفَوْنَ.

یا خود ئەڵێین: ـ مرون ئەصلە قەریبە کەی مُرْأَیُونَ بوو، وەکو مُکْرَمُونَ حەذفی همزە کە مان کرد لەبەر تخفیف پاش نقڵی فتحە کەی بۆلای ماقبلە کەی گەڕا بە مُرَیُونَ، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بـە ئـەلف.وە ئەلفە کەمان حەذف کرد لە بەر دەفعی التقاءالساکنین گەڕا بە مُرَوْنَ.

«مُرٰأَةٌ» بۆ اسمی مفعولی مؤنثی بابی افعال، ئەصڵە کەی مُریً بـوو، تێی تأنیثمان پێوە ئیلحاق کرد، وەتێ مقتضی فتحەی ماقبلی بوو، ماقبلە کەمان ئیعادە کردە وە بە مفتوحی، جا یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەرا بە مُرٰاةٌ، لەسەر وەزنی مُفَلْةٌ، بە حەذفی عینالفعلە کەی.

مُرٰاتٰانِ مُرَيٰاتٌ وَ تَقُولُ فِي الأَمْرِ أَرِ، أَرِيٰا، أَرُوا، أَرِي، أَرِيٰا، أَرِينَ.

«مُرٰاتٰانِ» بو اسمی مفعولی تثنیه‌ی مؤنث، ئه‌صڵه که‌ی مَرْأَيَتٰانِ بوو، وه‌کو مُكْرَمَتٰانِ، حه‌ذفی همزه که‌مان کرد پاش نـقڵی فـتحه کـه‌ی بـۆلای ماقبله که‌ی، پاشان یێ متحرک ماقبل مفتوح قه‌لبمان کرد به ئه‌لف گه‌ڕا به مراتان.

«مُرَيٰاتٌ» بۆ اسمی مفعولی جمعی مؤنث، ئه‌صڵه کـه‌ی مُراةٌ بـوو، ئه‌لف و تیٚ عه‌لامه‌تی جمعی مؤنثی سالم بون ئیلحاقمان کرد به ئـاخریه وه، له‌به‌ر ئجتماعی دو عه‌لامه‌تی تأنیث حه‌ذفی تیٚی مفره‌ده که‌مان کرد، جا ئه‌لف باعثی فتحه‌ی ماقبلی بوو لام‌الفعله کـه‌مان ئیعاده کـرده وه بـه مفتوحی گه‌ڕا به مُرَيٰاتٌ.

وه یا خود ئه‌ڵێین مریات ئه‌صڵه قه‌ریبه که‌ی مُرْئَيٰاتٌ بوو، حه‌ذفی همزه که‌مان کرد له‌به‌ر تخفیف له پاش نقڵی فتحه که‌ی بۆلای ماقبله که‌ی گه‌ڕا به مُرَيٰاتٌ.

«وَ تَقُولُ فِي الأَمْرِ» تۆ ئه‌ڵێی له بنای ئه‌مری به صیغه له ماده‌ی رأی له بابی افعال دا: ـ

«أَرِ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئه‌صڵه که‌ی تُری بوو، به ضمه‌ی تیٚ و کسره‌ی ری، تیٚ حه‌رفی مضارع بوو حه‌ذفمان کرد، وه هـمزه‌ی قـطعه که‌مان ئیعاده کرده وه، وه ئاخره که‌مان مجزوم کرد به حـه‌ذفی لام‌الفـعل گه‌ڕا به أَرِ به دو حه‌رف له‌سه‌ر وه‌زنی أَفِ، به حه‌ذفی همزه‌ی عین‌الفعل وه یێ لام‌الفعل.

## وَ بِالتَّأْكِيدِ: أَرِيَنَّ، أَرِيَانِّ، أَرُنَّ، أَرِنَّ، أَرِيَانِّ، أَرِينَانِّ

«أَرِيَا» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب ئەصڵەکەی تُرِيَانِ بوو، حاصڵ بووە بە حەذفی حەرفی مضارع، وە ئیعادەی همزەی قطع، وە حەذفی نونی تثنیەی مضارعەکەی.

«أَرُو» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی تُرُونَ بە ضمەی تێ وە ڕێ، حاصل بووە بە حەذفی حەرفی مضارع وە ئیعادەی همزە قطعەکەی، وە حەذفی نونی جمع لە ئاخری مضارعەکە یەوە.

«أَرِي» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵەکەی تُرِينَ بوو، حاصڵ بووە بە حەذفی حەرفی مضارع وە ئیعادەی همزە قطعەکەی، وە حەذفی نونی ئیعراب لە ئاخریەوە.

«أَرِيَا» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، وەکو تثنیەی، مذکری مخاطب.

«أَرِينَ» بو جمعی مؤنثی مخاطب مشتقە لە تُرِين، حاصڵ بووە بە حەذفی حەرفی مضارع وە ئیعادەی همزە قطعەکەی، وە هێشتنە وەی نونەکەی چونکە ضمیری فاعلی جمعی مؤنثە.

«و بالتأكيد»: ئەڵێت: لە کاتی تأکیدی ئەمری بابی افعال لە مادەی رأی.

«أَرِيَنَّ» بۆ مفردی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی أَرِ بوو بە دو حەرفی همزە و ڕێ مؤکدمان کرد بە نونی ثقیلە وە، جا ئیعادەی لامالفعلە کەمان کردە وە بە مفتوحی لە بەر تقضای نونە توکیدەکە گەڕا بە أرينّ.

«أَرِيَانِّ» بۆ تثنیەی مذکری مخاطب، ئەصڵەکەی أَرِيَا بوو مؤکدمان

وَبِالنَّهِیْ: لٰاتُرِ، لٰاتُرِیٰا، لٰاتُرُو ـ لٰاتُرِی، لٰاتُرِیٰا، لٰاتُرِینَ.

---

کرد به نونی ثقیله وه، وه نونه کەمان مکسور کرد گەڕا به أریانّ.

«أَرُنَّ» بۆ جمعی مذکری مخاطب، ئەصڵه کەی أرو بوو مؤکدمان کرد به نونی ثقیله وه، جا التقاءالساکنین، ڕوی دا له بەینی واو وه نونه کەدا دروست نەبوو حەذفی نونه که لەبەر رعایەتی تأکیده که، بەڵام حەذفی واوه که مان کرد لەبەر اکتفا به ضمەی ماقبله کەی گڕا به أَرُنَّ له سەر وەزنی أفنَّ به حەذفی عین‌الفعل وه لام‌الفعل وه واوی جمعه کەیشی.

«أَرِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی أَرِی بوو، مؤکدمان کرد به نونی ثقیله وه جا التقاءالساکنین ڕوی دا له بەینی یێ و نونه کەدا دروست نەبو حەذفی نونه که لەبەر تأکید، بەڵام حەذفی یێ کەمان کرد لەبەر اکتفا به کسرەی ماقبله کەی گەڕا به أَرِنَّ.

«أَرِیٰانِّ» بۆ تثنیەی مؤنثی مخاطب، دروست کراوه وەکو تثنیەی مذکری مخاطب.

«أَرِینٰانِّ» بۆ جمعی مؤنثی مخاطب، ئەصڵه کەی أَرِینَ بوو مؤکدمان کرد به نونی ثقیله وه، وه هاتین به ئەلفێ له بەینی نونه کانا وه نونه تأکیده کەمان مکسور کرد گەڕا به أَرِینٰانِّ.

«وَبِالنَّهِیْ» تۆ ئەڵێیت له کاتی داخڵ کردنی لای ناهیه لەسەر فعلی مضارعی بابێ افعال له مادەی رأی.

«لٰاتُرِ» تا ئاخری هەموو صیغه کانی به حەذفی همزەی عین‌الفعل مطلقاوه حەذفی لام‌الفعلی مفردی بێ نون، وه حەذفی نون له تثنیەدا

وَبِالتَّأْكِيدِ: لَاتُرِيَنَّ، لَاتُرِيَانِّ، لَاتُرُنَّ، لَاتُرِنَّ، لَاتُرِيَانِّ، لَاتُرِينَانِّ

مطلقا، وە لە جمعی مذكر وە مفردی نون دارا كە تەنها صیغەی مفردی مؤنثی مخاطبە، وە هێشتنە وەی نونی جمعی مؤنث.

«لَاتُرِيَنَّ» بۆ نهی لە مفردی مذكری مخاطب مؤكد بە نونی تأكیدەوە ئەصڵەكەی لاتُرِ بو مؤكدمان كرد بە نونی ثقیلە وە ئعادەی لام‌الفعلە كەمان كردە وە گەڕا بە لاترينَّ.

«لَاتُرِيَانِّ» بۆ تشنیەی مذكری مخاطب، ئەصڵە كەی لاتریا بوو، مؤكدمان كرد بە نونی ثقیلە، وە نونە كەمان مكسور كرد گەڕا بە لاتريان.

«لَاتُرُنَّ» بۆ جمعی مذكری مخاطب، ئەصڵە كەی لاترو بوو مؤكدمان كرد بە نونی ثقیلە، جا التقاءالساكنين ڕوی دا لە بەینی واو وە نونە كەدا دروست نەبوو حەذفی نونە كە بكەین لەبەر رعایەتی تأكیدە كەی، بەڵام حەذفی واوە كەمان كرد لەبەر اكتفا بە ضمەی ماقبلە كەی گەڕا بە لَاتُرُنَّ بە ضمەی تێ وە ڕێ لەسەر وەزنی لاتفنَّ بە حەذفی عین‌الفعل وە لام‌الفعل وە واوی جمعی مذكر.

«لَاتُرِنَّ» بۆ مفردی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە كەی لاتری بوو مؤكدمان كرد بە نونی ثقیلە، جا التقاءالساكنين ڕوی دا لە بەینی یێ و نونە كە دا، دروست نەبوو حەذفی نونە كە بكەین لەبەر رعایەتی تأكیدە كەی، بەڵام حەذفی یێ ضمیر فاعلمان كرد لە بەر اكتفا بە كسرەی ماقبلە كەی گەڕا بە لاتُرِنَّ

«لَاتُرِيَانِّ» بۆ تشنیەی مؤنثی مخاطب، ئەصڵە كەی لاتریا بوو، دروست

وَ تَقُولُ فِی: اِفْتَعَلَ مِنْ مَهْمُوزِالْفٰاءِ: اِیتٰالَ کَاِخْتٰارَ، وَاِیتَلٰی کَاِقْتَضٰی.

کراوه وەکو تثنیەی مذکری مخاطب.

«لاُتَرِیْنٰانِّ» بۆ جمعی مؤنث مخاطب، ئەصڵەکەی لاترین بوو، مؤکدمان کرد بە نونی ثقیله، وە هاتین بە ئەلفێ لە بەینی نونەکانا، وە نونه جمعەکەمان مکسور کرد گەڕا بە لاترینانِّ.

«وَ تَقُولُ فِی: اِفْتَعَلَ مِنْ مَهْمُوزِالْفٰاءِ: اِیتٰالَ کَاِخْتٰارَ، وَاِیتَلٰی کَاِقْتَضٰی.»

تۆ ئەڵێیت: لە بنای بابی افتعال دا لە مهموزالفای أجوف ایتال وەکو اختار، ئەصڵەکەی اِئْتٰال بوو بە دو همزە یەکێ همزەی وەصڵ وە یەکێ فاءالفعل، جا همزەی ثانی ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە ایتال.

(ئەڵێی ایتاله أی أَصْلَحَهُ.وەکو لە قاموسایە)

واِیتَلٰی کَاِقْتَضٰی.وە تۆ ئەڵێی لە مهموزالفای ناقص دا ایتلی ئەصڵەکەی اِئْتَلٰی همزەی ثانی ساکن ماقبل مکسور قەلبمان کرد بە یێ گەڕا بە ایتلی یانی سویندی خوارد.

بێداربن: هۆی باسکردنی ئەم دو صیغه بە تایبەتی ئەمەیە بزانن یێ مبدل لە همزە قەلب ناکرێ بە تێ هە تا دەغم بکرێ لە وتی یەی واله دوایه وە، بەلام یێ ئەصڵی قەلب ئەکرێ بە تێ وە دەغم ئەکرێ لە تێی دواوه یدا، وەکو ڕا بورد لە اتسردا.

# فصــــل

## فَصْلِ فِی بَنٰاءِ اِسْمی الزَّمٰانِ وَالْمَکٰانِ وَهُمٰا مِنْ یَفْعِلُ بِکَسْرِالْعَیْنِ عَلٰی وَزْنِ مَفْعِلٍ مکسورالعین: کَالْمَجْلِسِ وَالْمَبِیتِ.

---

«فَصْلِ فِی بَنٰاءِ اِسْمی الزَّمٰانِ وَالْـمَکٰانِ» ئەمە فەصلێکە باسی دروستکردنی اسمی زەمان و مکان ئەکات.

اسمی زەمان و مکان دروست ئەکرێن لە فعل بۆ دەلالەت کردنی لەسەر کات و شوێنی ئەو فعلە بە بێ تقید بە فاعیلێکی دیاری یا بە کات و شوێنێکی دیاری یە وە.

«وَهُمٰا مِنْ یَفْعِلُ بِکَسْرِالْـعَیْنِ عَـلٰی وَزْنِ مَـفْعِلٍ مکسـورالعـین: کَالْمَجْلِسِ وَالْمَبِیتِ.» واتە اسمی زەمان و مکان ئەگەر دروست بکرێن لە یفعِل بە کسرەی عین‌الفعل وەکو یَضْرِبُ لەسەر وەزنی مَـفْعِلْ ئـەبن، بـە فتحەی میمی زائدە لە ئەوەڵیە وە، وە کسرەی عین‌الفعل خـوای لە سـالم دروست بکرێت وەکو مَجْلِس بۆکات و شوێنی دانیشتن مشتقە لە یَجْلِسُ وەکو یَضْرِبُ، حەذفی حـەرفی مـضارەعە کـەمان کـرد وە لە بـاتی ئـەودا میمێکی مفتوحەمان لە جێگە یا دانا گەڕا بە مَجْلِس.

وە یا لە معتل دروست بکرێ وەکو مَبِیت کە مشتقە لە یَبِیتُ حـەذفی حەرفە مضارعە کەمان کرد، وە لە جێگەی ئەوا میمێکی مفتوحەمان دانـا گەڕا بە مَبِیتٌ.

وە ئەگەر لە یفعَل بە فتحەی عین‌الفعل یا لە یفعُل بە ضمەی عین‌الفعل

وَمِنْ يَفْعَلُ بِفَتْحِ الْعَيْنِ وَ ضَمِّها عَلٰى مَفْعَلٍ مَفْتُوح العين: كَـالْمَذْهَبِ وَالْمَقْتَلِ وَالْمَشْرَبِ وَالمَقَامِ. وَشَذَّ: الْمَسْجِدُ وَالْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ

---

«وَمِنْ يَفْعَلُ بِفَتْحِ الْعَيْنِ وَ ضَمِّها عَلٰى مَفْعَلٍ مَفْتُوح العين: كَالْمَذْهَبِ وَالْمَقْتَلِ وَالْمَشْرَبِ وَالمَقَامِ.»

دروست بكرێ ئەوە لەسەر وەزنی مَفْعَلْ ئەبن بە فتحەی عین‌الفعل لەبەر موافقەی عین‌الفعلی مضارع لە مفتوح‌العین دا، وە لە بەر تخفیف لە مضموم‌العین دا.

ئیتر بێ فەرقە ئەمانە لە فعلی سالم دروست بكرێن وەكو مَذْهَبْ مشتقە لە یذهب بە فتحەی عین‌الفعل.

وە مقتل كە مشتقە لە یَقْتُل بە ضمەی عین‌الفعل، وە یالە معتل‌العین دروست بكرێن وەكو مقام كە مشتقە لە یَقُوم.

لە هەموو ئەمانە دا حەذفی حەرفی مضارعمان كردوە، وە لە جێگەی ئەودا میمێكی مفتوحەمان داناوە، وە عین‌الفعلە كەمان مفتوح كردوە لە مضموم‌العین دا، وە بە مفتوحی هێشتومانە تە وە لە مفتوح‌العین دا.

مثلاً: ئەڵێین مقام مشتقە لە یقوم، یێ‌مان حەذف كرد، وە میمێكی مفتوحەمان لە جێگەی دانا، وە عین‌الفعلە كەمان مفتوح كرد گەڕا بە مَقْوَمٌ جاقەلبی عین‌الفعلە كەمان كرد بە ئەلف پاش نقڵی فتحە كەی بۆلای ماقبلە كەی گەڕا بە مَقَامٌ.

«وَشَذَّ: الْمَسْجِدُ وَالْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ وَالْمَطْلِعُ وَالْمَجْزِرُ وَالْمَرْفِقُ

وَالْمَطْلِعُ وَالْمَجْزِرُ وَالْمَرْفِقُ وَالْمَسْكِنُ وَالْمَنْسِكُ وَالْمَنْبِتُ وَالْمَسْقِطُ عَلَى مَفْعِلٍ بِكَسْرِ الْعَيْنِ فِيهَا كُلِّهَا وَحُكِيَ الْفَتْحُ فِي بَعْضِهَا هٰذَا إِذَا كَانَ الْفِعْلُ صَحِيحَ الْفَاءِ وَاللاَّمِ وَأَمَّا فِي غَيْرِهِ: فَمِنَ الْمُعْتَلِّ الْفَاءِ يَكُونُ عَيْنُ فِعْلِهِ مَكْسُوراً أَبَداً: كَالْمَوْعِدِ وَالْمَوْضِعِ، وَمِنَ الْمُعْتَلِّ اللاّمِ يَكُونُ مَفْتُوحَ الْعَيْنِ أَبَداً: كَالْمَأْوىٰ وَالْمَرْمىٰ.

---

وَالْمَسْكِنُ وَالْمَنْسِكُ وَالْمَنْبِتُ وَالْمَسْقِطُ عَلَى مَفْعِلٍ بِكَسْرِ الْعَيْنِ فِيهَا كُلِّهَا» واتە دەر چوە لە دەستور و یاسای دروستکردنی اسمی زەمان و مکان ئەم نۆ صیغە کە ئەخوێنرێنەوە لەسەر وەزنی مَفْعِلْ بە کسرەی عین‌الفعل مع أنە قیاس وایە کە لەسەر وەزنی مفعل بخوێنرێنە وە بە فتحەی عین‌الفعل چونکی مضارعی منسک بە فتحەی عین‌الفعلە، وە مضارعی باقیە کەیانبە ضمەی عین‌الفعلە.

«وَحُكِيَ الْفَتْحُ فِي بَعْضِهَا» وە نقل کراوە مَفْعَلْ بە فتحەی عین‌الفعل لە بەعزێک لەمانەدا، وەکو: مسجد وە مسکن وە لەو کاتا استعمالە کەیان لەسەر یاسای خۆیانە.

«هٰذَا إِذَا كَانَ الْفِعْلُ صَحِيحَ الْفَاءِ وَاللاَّمِ» واتە ئەم دەستورە کەوتمان اسمی زەمان و مکان لە مضارعی مکسورالعین لەسەر مفعل ئەبێ بە کسرەی عین.وەلە مضارعی مفتوح و مضمومالعین لەسەر مفعل ئەبێ بە فتحەی عین‌الفعل لە کاتێکایە کە ئەوفعلە فاءالفعل وە لام‌الفعلی حەرفی علله نەبێ...

«وَأَمَّا فِي غَيْرِهِ: فَمِنَ الْمُعْتَلِّ الْفَاءِ يَكُونُ عَيْنُ فِعْلِهِ مَكْسُوراً أَبَداً: كَالْمَوْعِدِ وَالْمَوْضِعِ، وَمِنَ الْمُعْتَلِّ اللاّمِ يَكُونُ مَفْتُوحَ الْعَيْنِ أَبَداً: كَالْمَأْوىٰ وَالْمَرْمىٰ.»

**وَقَدْ تَدْخُلُ عَلٰى بَعْضِهَا تَاءُ التَّأْنِيثِ: كَـالْمَظَنَّةِ والْـمَقْبَرَةِ وَالْـمَشْرَقَةِ وَشَذَّالْمَقْبُرَةُ وَالْمَشْرُقَةُ بِالضَّم فِيهِمَا**

---

وە ئەمما غیری ئە وانە، ئەوە لە معتل‌الفادا عین‌الفعلی اسمی زەمان و مكان مكسور ئە بێ بە دەوام وەكو: مَوْعِد وە مَوْضِع بە كسرەی عین‌الفعل، وە لە معتل‌اللامدا لەسەر وەزنی مَفْعَلْ ئە بێ بە فتحەی عین‌الفعل بە دەوام، وەكو: مَأْوٰی وە مَرْمٰی كە معتل‌اللامن ئەمانە لەسەر وەزنی مَفْعَلْ هاتون، بە فتحەی عین‌الفعل.

«وَقَـدْ تَـدْخُلُ عَـلٰى بَـعْضِهَا تَـاءُ التَّأْنِـيثِ: كَـالْمَظَنَّةِ والْـمَقْبَرَةِ وَالْمَشْرَقَةِ» واتە: جاربە جار اسمی زەمان و مكان الحاق ئە كرێ پێیانە وە تێ ی تأنیث، وەكو مظنّة بو زەمان و مكانی گومان و باوەڕ بە بونی شتێ، وە مقبرة بۆ مكانی كە مردوی تیا بكرێتە ژێر خاك و بشارێتە وە.وە مَشْرَقة بۆ شوێنی دەر كەوتنی ڕوناكی هەتاو ئەمانە هاتنیان لەسەر وەزنی مفعل بـە فتحەی عین‌الفعل قیاسە ولە جێگەی خویایەتی، بەڵام ئلحاقی تێ ی تأنیث پێیانە وە خلافی قیاسە.وە بازێ لە زاناكان فەرمویانە: الحاق ئەم تێ‌یە بەم كلماتە وە یا لەبەر ئەوەیە اظهاری مبالغە بكرێ لە وجودی ئەصڵی حدثەكە لەو شوێنا.یا لە بەر ئەوەیە كە ئیرادەی شوێنە كە كراوە بە خصوصی، لە بەر ئەو لەسەز یاسای مەعنای اسمی زەمان و مكان نە ماون، كە وابو ئـەمانە خارجن لە اسمی زەمان و مەكانی اصطلاحی ئێمە.

«وَشَذَّالْمَقْبُرَةُ وَالْمَشْرُقَةُ بِالضَّم فِـيهِمَا» واتـە شـاذە خـوێندنەوەی عین‌الفعلی ئەم دو لفظە بە ضمە چونكی قیاس لە وانا، وە لە نظیر ئەوانـا

وَمِمّٰازٰادَ عَلٰی الثَّلاٰثَةِ کَأَسْمِ الْمَفْعُولِ: کَـالْمُدْخَلِ وَالْـمُقٰامِ. وَاِذٰا کَـثُرُ اَلشَّیءُ بِالْمَکٰانِ قِیلَ فِیهِ مَفْعَلَةٌ فِـی الثُّـلاٰثِّیِ الْـمُجَرَّدِ.فَـیُقٰالُ: أَرْضٌ مَسْبَعَةٌ وَمَأْسَدَةٌ وَمَذْئَبَةٌ و مَطْبَخَةٌ وَمَقْثأَةٌ

---

فتحەی عین‌الفـعل «وَمِمّٰازٰادَ عَلٰی الثَّلاٰثَةِ کَأَسْمِ الْـمَفْعُولِ: کَـالْمُدْخَلِ وَالْمُقٰامِ.»

واتە صیغەی اسمی زەمان و مکان لە و فعلاناکە زیادبن لەسەر سـێ حەرف خوای رباعی مجرد یا مزید فیە وە یا ثلاثی مـزید فـیە بـن، دێت لەسەر وەزنی اسمی مفعول ئەو بـابە وەکـو: مُـدْخَل بـە ضـمەی مـیم وە فتحەی ماقبلی ئاخرەکەی.

وە مُقام بەو وێنە بۆ اسمی زەمان و مکانی بابی افعال لەسەر شـێوەی اسمە مفعولەکەیان...

«وَاِذٰا کَــثُرُ اَلشَّــیءُ بِــالْمَکٰانِ قِـیلَ فِـیهِ مَـفْعَلَةٌ فِـی الثُّـلاٰثِّیِ الْمُجَرَّدِ.فَیُقٰالُ: أَرْضٌ مَسْبَعَةٌ وَمَأْسَدَةٌ وَمَذْئَبَةٌ و مَطْبَخَةٌ وَمَقْثأَةٌ» واتە کاتێ شتێک زۆربێت لە شوێنێک دا ئـەوە بـۆ بـەیانی زۆری ئـەوشتە لەو شوێنا صیغەی مَفْعَلە دروست ئەکرێ.بـە فـتحەی مـیم و عـین‌الفـعل وە الحاقی تێی تأنیث، جا ئەوترێ أرض مَسْبَعَة بۆ عەرزێ درندەی زوری تیابێ.

وَ مأْسَدَةٌ بۆ عەرزێ شێری زۆری تیابێ.وَ مَـذْئَبَةٌ بـۆ شـوێنێ گـورگی زۆری تیابێ.وَمَبْطَخَةٌ بۆ عەرزی کە کاڵەکی زوری تیابێ.وە مَقْثَأَةٌ بۆ شوێن و عەرزێ کە خەیارو ترۆزی زۆری تیابێ.وە لە هەموو ئەو کلماتانە دا کـە

......................................................

حەرفەكانى لە ژورووى سىٚ حەرفى وە بىٚ زيادەكەى حەذفى ئەكرىٚ وەكو يەكى لە ثىيەكان (ث) لە مقثأةدا، بەلاّم ئەم ياسايە هەربۆ ثلاثى بەكار دێت، ئەگيناله لە روباعى مجرد وە مزيد فيە وە خماسيى مجرد وە مزيد فيە، وە لە سداسى و زياتر لەودا كلمەى (كثير) بەكار دێت بە اضافە بۆلاى ئەو شتە زورە كە مثلاً ئەلێت: مكان كثيرالثعلب، أو كثيرالغَضَنْفِر، أو كثيرالعصفور و هكذا...

# فصـــل

وَأَمَّا اِسْمُ الآلة: وَ هُوَ مَايُعَالِجُ بِهِ الْفَاعِلُ الْمَفْعُولَ لِوُصُولِ الأَثَرِ اِلَـيْهِ كَالْمِنْحَتِ. فَيَجِيءُ عَلٰى مِثَالِ مِحْلَبٍ و مِكْسَحَةٍ وَ مِـفْتَاحٍ و مِـصْفَاةٍ وَقَالُوا مِرْقَاةٌ بِكَسْرِ الْمِيمِ عَلٰى هٰذَا وَ مَنْ فَتَحَ الْمِيمَ أَرَادَ الْمَكَانَ

---

«وَأَمَّا اِسْمُ الآلة: وَ هُوَ مَايُعَالِجُ بِهِ الْفَاعِلُ الْمَفْعُولَ لِوُصُولِ الأَثَرِ اِلَيْهِ كَالْمِنْحَتِ.» واته اسمی ئالەت شتێکە کە کار کەر بەو شتە خەریکی کـار ئەبێت لە جێگە یەکدا بۆئەوە نیشانە یەک لەو شوێنا بنوێنێ، وەکو مِنْحَت بە کسرەی میم وە سکونی نون وە فتحەی حی.بۆ تە شوی‌ی دار تـاش کـە بیەوی لە دارێ دەرگایە یاکور سی یەک دروست بکات.

«فَيَجِيءُ عَلٰى مِثَالِ مِحْلَبٍ و مِكْسَحَةٍ وَ مِفْتَاحٍ و مِـصْفَاةٍ» ئـەوە دێت لەسەر وەزنی مِفْعَلْ وە مِفْعَال بە کسرەی میم وە فتحی عین‌الفـعل، وەکو: مِحْلَبْ بۆ ئالەتی دۆ شـینی حـەیوان.وە مـفتاح کـلیلی کـردنە وەی دەرگای داخراو وە لەسەر وەزنی مِفعَلَة وارد ئەبێ، وەکو مِکسحة کە ناوی گسکە، وە مِصفاةٍ کە ناوی شیرپاڵێوە، وە ئەصڵە کەی مِصْفیَة بوو، جا (یێ) متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد وە بە ئەلف بو بە مِصْفاة.

«وَقَالُوا مِرْقَاةٌ بِكَسْرِ الْمِيمِ عَلٰى هٰذَا» وە عەرەب خوێندویانە تـەوە مرقاة بە کسرەی میم وە سکونی ری وە فتحەی قاف بۆ پـەینجەی سـەر کەوتن بۆ شوێنی بە رز، ئەصڵە کەی مِرقیَة بوو، یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەرا بە مِرْقاةٌ.

«وَ مَنْ فَتَحَ الْمِيمَ أَرَادَ الْمَكَانَ» وە هەر کەس میمی مرقاة بە مفتوحی

وَشَذَّ: مُدْهُنٌ و مُسْعُطٌ و مُدُقٌ و مُنْخُلٌ مُكْحُلَةٌ و مُحْرُضَةٌ مَضْمُومة الْمِيمِ وَالْعَيْنِ وَجاءَ مِدقٌ و مِدَقَةٌ بِكَسْرِ الْمِيمِ وَ فَتْحِ الْعَيْنِ عَلَى الْقِيَاسِ

خوێندەوە، ئەوە مەبەستی ئەوە بووە کە بە اسمی مکانی دابنێ، واتە جێگەی سەر کەوتن نەک بە اسمی ئالەتی بخوێنێتە وە.وە لەو حالا فتحەی میمێکە موافقی أصوله وە مرقاة ئەبێ بە مَفعلة بە فتحەی میم وە عین‌الفعل ئەوەندە هەیە وجودی تێ ی تأنیثە کە زیادە، وە ممکنە ئەو کەسە مرقاتی بە فتحەی میم کرد بێ بە ناو بو پەینجە یەکی تایبەتی.وە ئەصڵی مرقاة مرقیة بوو یێ متحرک ماقبل مفتوح قەلبمان کرد بە ئەلف گەرا بە مرقاة.

«وَشَذَّ: مُدْهُنٌ و مُسْعُطٌ و مُدُقٌ و مُنْخُلٌ و مُكْحُلَةٌ و مُحْرُضَةٌ مَضْمُومة الْمِيمِ وَالْعَيْنِ» واتە شاذە و خارجە لە یاسای صیغەی اسمی ئالەت ئەم چەند اسمە ئالەتە بە ضمەی میم وە عین‌الفعل خوای بە بێ تێ بن وەکو: مدهن بۆ چەوری دان، و مسعط بو قوتویی برنوتی وە مدق بۆ دەسکە ئاوان وە منخل بو بێژنگ.

یا لەگەڵ تێ دابن وەکو: مکحلة بۆ ئالەتی کلدان و کلتور.وە مُحُرضة بۆ کیسەی ئەسپون، لەبەر ئەوە یاسا لەمانەدا کسرەی میم وە فتحەی عین‌الفعل وە الحاق نە کردنی یێ یە بە ئاخریانە وە.

وە بازی لە زاناکان فەرمویانە: وجهی نیە بو ژماردنی ئەمانە بە شاذ چونکە ئەمانە اسمی ئالەت نین.وە هەر کام ناون بو شتێکی تایبەتی.

«وَجاءَ مِدقٌ و مِدَقَةٌ بِكَسْرِ الْمِيمِ وَ فَتْحِ الْعَيْنِ عَلَى الْقِيَاسِ» وە هاتووە ئەم دو لفظە بە کسرەی میم وە فتحەی عین‌الفعل لەسەر قانونی صیغەی اسمی ئالەت ئەوەندە هەیە الحاقی تێ پێیە وە خارجە لە قیاس.

## تَنْبِيهٌ:

**الْمَرَّةُ مِنْ مَصْدَرِ الثّلاثِيّ المجرَّدِ عَلٰى فَعْلةٍ بِـالْفَتْحِ تَـقُولُ: ضَـرَبْتُ ضَرْبَةً و قَمْتُ قَوْمَةً وَمِمَّا زٰادَ عَلَى الثَّلاثَةِ يَكُونُ بِزِيٰادَةِ الْهٰاءِ كَأَعْطائَةً وَالأِنْطِلاقَةُ وأِسْتِخْراجَةً وَ تدحْرُجَةً**

ئەمە بیدار کردنە وەی مصنفە بۆ شاگردە کانی لەسەر دروست کردنی مصدەری مرَّة و نوع لە ثلاثی مجرد و غیری ثلاثی مجردا جـافەرموی: ـ «**الْمَرَّةُ مِنْ مَصْدَرِ الثّلاثِيّ المجرَّدِ عَلٰى فَعْلةٍ بِالْفَتْحِ تَـقُولُ: ضَـرَبْتُ ضَرْبَةً و قَمْتُ قَوْمَةً**» واتە ئەو مـصدەرەی کـە دەلالەت بکـات لەسـەر تاقەجاری لە مدلولە کەی: ـ

ئەگەر لە ثلاثی مجردا دروستی بکەی ئەوە یاساو اصـولە کـەی وایـە لەسەر وەزنی فَعْلَة بێ بە فتحەی فاءالفعل وە سکونی عین‌الفعل وە فتحەی لام‌الفعل لەگەڵ الحاقی تێ بە ئاخریە وە، وەکو ئەڵێێت: ـضَرْبتُ ضَرْبَة یانی دام لە فڵان یەک جارڵیدان.وە قمت قومة یانی هە ستامە سەرپێ یەکجار هەستان.

«**وَمِمَّا زٰادَ عَلَى الثَّلاثَةِ يَكُونُ بِزِيٰادَةِ الْهٰاءِ**» وە بنای مصدەری مرّة لە فعلێک زیاتر بێت لەسەر سێ حەرف خوای رباعی مجردی یا مزید فیە وە یا ثلاثی مزید فیە بێ ئەوە بە زیاد کردنی تێ‌ی تأنیث لەسەر مصدەری ئەو بابە ئیتر دەست لە وەزنی مصدەری ئـەو بـابە نـادری.«**كَأِعْـطائَةً وَ انطلاقةً و أِسْتِخْراجَةًوتَدَحْرُجةً**» ئەم مصدەرانە مصدەری مەڕەن بۆ بابی افعال وە انفعال وە استفعال وە تفعلل لەو مادانە وە پـەیدا بـوون بـە زیـاد کردنی تێ لەسەر: اعطاء وە انطلاق وە استخراج وە تدحرج.

اِلاّ ماء فِيهِ تاءُالتَّأْنِيثِ منها فَالْوَصْفُ بِالْواحِدَةِ واجِبٌ كَقَوْلِكَ رَحْمَتُهُ رَحْمِةً واحِدَةً وَ دَحْرَجْتُهُ دَحْرَجَةً واحِدَةً وَاطْمَأْنَنْتُ طُمَأْنِينَةً واحِدَةً وَالْفِعْلَةُ بِالْكَسْرِ لِلنَّوْعِ تَقُولُ هُوَ حَسَنُ الطِعْمَةِ وَالْجِلْسَةِ

---

«اِلاّ ماء فِيهِ تاءُالتَّأْنِيثِ منها فَالْوَصْفُ بِالْواحِدَةِ واجِبٌ» ئيللا مصدەرێ نەبێ لە ثلاثی و غیرە ثلاثی کە خوێ لە ئەصڵی وەضعا تێ ی تیابێ، ئەوە لەوانا مصدەری مرّە بە هێنانی صیفەتی واحدة بۆ افادەی مەعنای مرە واجبە

«كَقَوْلِكَ رَحمتُهُ رَحْمَةً واحِدَةً» لە ثلاثی مجرەدا «وَ دَحْرَجْتُهُ دَحْرَجَةً واحِدَةً» لە رباعی مجردا «وَاطْمَأْنَنْتُ طُمَأْنِينَةً واحِدَةً» لە رباعی مزید فیە دا».ئەمانە لەبەر ئەوە لە ئەصڵی وەضعی مصدەرە تأکید یەکانیاندا تێ هەیە پێوێستە بە جیا کردنە وەی مصدەری مرّە لە مصدەری تأکیدی کە لفظی واحدة زیاد بکرێ لەسەر مصدەرە کانیان.

«وَالْفِعْلَةُ بِالْكَسْرِ لِلنَّوْعِ» وە وەزنی فِعْلَة بە کسرەی فاءالفعل وە سکونی عینالفعل وە فتحەی لامالفعل وەتێ لە ئاخریە وە دانراوە بۆ دەلالەت لەسەر مصدەری نوعی یانی بۆ مصدەری کە دەلالەت بکات لەسەر ئەو صیفەت و هیئەت و شێوە کە فعلە کەی لەسەر کراوە.

«تَقُولُ هُوَ حَسَنُ الطِعْمَةِ وَالْجِلْسَةِ» تۆ ئەڵێیت بۆ بە یانی هیئەتو صفەتی فعل.فڵانە خواردە مەنی خۆشە و بە لەزەت: وە فڵانە کەس دانیشتنی جوان و بە ئەدەب و مناسبە. ئیستە لفظی طِعمة و جِلسة بە کسرەی فاءالفعل ئەو نەوعە تایبەتی یە ئەگەینن لە تام وە لە دانیشتن، وە اضافەی حسن افادەی ئەوە ئەکات کە ئەو نەوعە نەوعێکی جوانە.

والحاصڵ: بنای مصدەرە کە نەوعیەت ئەگە یەنێ، وە لفظی حَسَن یا

..............................................................

هەر لفظێکی تر بە یانی ئەو نەوعە ئەکات لە جوانی و شیرینی دا.

بێدار بنە وە: لە وەختێکا موزون بە فِعْلة بە کار ئەبرێ بۆ مصدەری نەوعی کە ئەو فعلە ثلاثی مجردە ذاتاً مصدەرە کەی لەسەر ئەو وەزن و شێوە نە بێ، ئەگەر نا هەر ئەصڵی مصدەری فعلی کە استعمال ئەکرێ بۆ مصدەری تأکیدی وە لفظێ زیاد ئەکرێ بو دەلالەت لەسەر مصدەری نەوعی، وەکو چون لفظی واحدة زیاد ئەکرا بو جیاکردنە وەی مصدەری مرّة لە مصدەری تأکیدی، مثلاً ئەڵێت: ـ دَحْرَجْتُهُ دَحْرَجَةً بۆ مصدری تأکیدی.و دَحْرَجْتُهُ دَحْرَجَةً واحِدَةً بۆ دەلالەت لەسەر مصدەری مرّە.وە چون لە مادەی رحم لە بابی رابع دا ئەڵێین: رَحِمْتُهُ رَحْمَةً بۆ مصدەری تأکیدی، و رَحِمْتُهُ رَحْمَةً واحِدَةً بۆ مصدەری مرّە، و رَحِمْتُهُ رَحْمَةً شامِلَةً لِأَهْلِهِ بۆ مصدەری نەوعی، وەلە مادە نَشَدَ بۆ مصدەری تأکیدی ئەڵێت: ـ نَشَدْتُ الضّالَّةَ نِشْدَةً، وە بۆ مصدەری مرە ئەڵێت: نشدت الضالة نشدةً واحدةً، وە بو مصدەری نەوعی ئەڵێت: ـ نَشَدْتُها نَشْدَةً جَيِّدَةً مُفِيدَةً.

هٰذا آخِرُالْكَلامِ مِنَ الْخادِمِ الْمتوانِى فِى شَرْحِ مَتْنِ تَصْرِيفِ الزَّنْجانِى وَأَسْئَلُ اللهَ الْقَدِيرَ أَنْ يُوَفِّقَنِى عَلٰى طَبْعِهِ وَ نَشْرِهِ، وَ يُوَفِّقَ اَبْناءَنا عَلٰى تَعلُّمِهِ وَ حِفْظِهِ وَ تَعْلِيمِهِ فِى سَبِيلِ خِدْمَةِ الْقُرْآنِ الْمُبِينِ وَ أَحادِيثِ سَيِّدِالْمُرْسَلِينَ صَلَواتُ اللهِ وَ سَلامُهُ عَلَيْهِ وَ عَلٰى اِخْوانِهِ وَ آلِهِ وَ صَحْبِهِ وَ أَتْباعِهِ بِإِحْسانٍ اِلٰى يَوْمِ الدِّينِ.

---

ئەم کتابە تە پاک نوسە ئەنجامی هات لە روزی دوشەممە بیست‌و شەشەمی مانگی شوال لە ساڵی هەزار و چوارصد و دوی هیجری مصادفی ۱۹۸۲/۸/۱۶ میلادی لە حوجرەی مدرسەی جامعی حەزرەتی شیخ عبدالقادری گیلانی دا نوراللە رَوْحَهُ وَ ضَرِيحَهُ آمِينْ.وَأَنَا الْمُؤَلِّفُ الْخادِمُ لِلْعِلْمِ وَالدِّينِ عَبْدُالْكَرِيمِ محمّدالمدّرس الکردیّ الشهرزوریّ غفرالله له ولوالدیه و للمسلمین آمین.

ریکخستن و دوبارە نوسینەوە و ئامادە کردنی بۆ چاپ ـ بە یاری خوا ـ تەواو بوو لە ڕۆژی شەممە ریکەوتی ۱۴۱۱/۱۰/۱۰ هجری بە رامبەر بە ۱۹۹۱/۵/۲۵ میلادی وە ۱۳۷۰/۳/۴ ه.ش لە لایەن مولودباوە مراد کردی لە شاری سنە دا.

وَ آخِرُ دَعْوانا أَنِ الْحَمْدُلِلّٰهِ رَبِّ الْعالَمِينَ.

وَالسَّلامُ